

دکتۆر عەلی وەردی

# وانەکانی ژیانم

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
مەودوود جەبار

ئامادەکردنی
ماجید سامەڕایی

# وانەکانی ژیانم

## عەزیز نەسین

ئامادەکردنی: ماجید سامەڕایی
وەرگێڕانی: مەودوود جەبار






ADIBAN

## ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد



**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، قولکەی گۆزەکان، نزیك ئاوەندیی ڕۆژهەڵاتی کوران.

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/


## ناسنامەی کتێب


**نـاونیشان:** وانەکانی ژیانم

**نـووسـەر:** عەلی وەردی

**ئامادەکردنی:** ماجید سامەڕایی

**بـــابـــەت:** کۆمەڵناسی

**وەرگـێڕانی:** مەودوود جەبار

**ژۆرەی چاپ:** چاپی یەکەم

**دیزاینی بەرگ:** عیسا عوسمان

**دیزاینی دەق:** ئارام مەلا محەمەد

**پــەخشانگە:** ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

# وتەیەک

## ئەم دەنگوباسانە

ئەم دەنگوباسەی کە گۆڤاری (التضامن) بڵاوی کردووەتەوە، بەندە هەر لە ڕۆژەکانی ســــەرەتایەوە تێیدا کارم کردووە و ڕۆژێکیشـــیان پێشـــنیارم بۆ بەڕێوەبەری گۆڤارەکە (مامۆســـتا فوئاد مەطەر) کرد، بەشکوو دکتۆر عەلی وەردی بخەینە نوسین. ئەویش بیرۆکەکەی زۆر پێ جوان بوو، بەڵام پرسی: مەگەر دەشێ بۆ ئێمە بنوسێت؟ بەندەش پێم گوت: لە نزیکەوە پەیوەندییم لەگەڵی هەیە و پەیوەندییەکەشـــمان زۆر باشە و سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەرایی شەستەکان...

ئەوەبوو دکتۆر وەردی، هەروەک ئەوەی چـاوەڕێم لێ دەکرد، بەدەنگ داواکارییەکەمانەوە هات ئێمە شتەکانی بەبێ دەسکاری و لێ بڕین بۆ بڵاو بکەینەوە. خۆم بەتایبەت پێم ڕاگەیاند: هەرگیز ڕێگە بە شتی لەو شێوەیە نادەم.

ئەو دەینوســـی و منیش ڕاســـپێردرابووم، ئەوەی ئەو هەفتـانە دەینوســـێت، بیگەیەنم. لە هەفتەی دواتردا، بە خۆم و نوســـخەی گۆڤارەکەوە بگەڕێمەوە لای و نوێیەکانیشـی لێ وەرگرم... ئەم کارە تا کۆتایی وەرز بەردەوام بوو.

پـاش ئەوە، پێشـــنیـاری ئەوەم بۆ کرد، لەبـارەی ئەو بـابەتـانەی ســـەرقالی دەکەن، گفتوگۆ بکەین، یان هەرکات بیرۆکەیەکم بۆ بهاتایە، ڕای ئەوم تێیدا وەرگرتایە... ئەمەش بوویە بەشی دووەمی کتێبەکەمان.

ئەمڕۆ، پـاش چـارەکە ســـەدەیەک لەو نوســـین و گفتوگۆیـانە، بەهایەکی نوێی فیکری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی تێدا دەبینرێتەوە.

ماجد السامرائی

## سەربوردەی ژیانی نوسەر

**عەلی حوسەین موحسین ئەلوەردی** (١٩١٣-١٩٩٥) زانای کۆمەڵناسیی عێراقی. مامۆستا و مێژوونووس، ناسراو بە هاوسەنگی و بابەتی‌بوون لە کارەکانیدا. پاشگری ناوی وەردی لە خێزانەکەیەوە بۆ ماوەتەوە لەبەرئەوەی باپیرە گەورەی کاری لە دروستکردنی دڵۆپاندنی ئاوی گوڵدا کردووە (گوڵاو گرتن).

عەلی وەردی، هاوڕێ لەگەڵ چەند کۆمەڵناسێکی دیکەدا، وەک مەجید خدووری[1]، یەکێک بووە لە یەکەمین کۆمەڵناسەکان کە

---

[1] - مەجید خەدوری (١٩٠٩ - ٢٠٠٧ز) لە عێراق لەدایک بووە. لە ساڵی ١٩٣٢ز دا لە بەیروتی لوبنان بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە هونەرە جوانەکان (الفنون) لە زانکۆی ئەمریکی بەدەست هێناوە. دواتر بڕوانامەی دکتۆرا لە یاسای نێودەوڵەتی و زانستە سیاسییەکاندا لە ساڵی ١٩٣٨ز دا بەدەست هێناوە و، لە ١٩٣٩ تاوەکو ١٩٤٧ لە وەزارەتی خوێندنی عێراقیدا، وەکو پرۆفیسۆری یاسا لە کۆلێژی مامۆستایانی باڵا کاری کردووە. لە ساڵی ١٩٤٦ز دا ئەندامی یەکەمین وەفدی عێراقی بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بووە و بەشداربووە لە نووسینی پەیڕەوی ڕێکخراوەکەدا. دامەزرێنەری قوتابخانەی پاول هێنری نیتز بۆ لێکۆڵینەوە جیهانییە پێشکەوتووەکان و بەرنامەی لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووە. خاوەنی بیرێکی فراوان و کەسایەتییەکی پێشەنگ بووە لە بوارەکانی زانستە ئیسلامییەکان و مێژووی نوێ و سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. سەرەڕای چەندین ووتار، زیاد لە ٣٥ کتێبی بە هەر دوو زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی نووسیوە.

**کارە بڵاوکراوەکانی:**

ليبيا الحديثة: لێکۆڵینەوەیەک لە بەرەوپێشچوونی سیاسی (١٩٦٤ز).

الإتجاهات السياسية في العالم العربي: ڕۆڵی بیرۆکە و بیردۆزەکان لە سیاسەتدا ( ١٩٧٠ز).

معاصرات عربية: ڕۆڵی کەسە دیارەکان لە سیاسەتدا ( ١٩٧٣ز).

الحرب والسلام في قانون الإسلام ( ١٩٧٧ز).

العراق الاشتراكي: لێکۆڵینەوەیەک لە زانستی سیاسی عێراقی ١٩٦٨ ( ١٩٧٨ز).

هەســـتــاون بە لێکۆڵینەوە لەبــارەی کۆمەڵگەی عێراقی لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی زانستیی شیکاریی مێژوویی.

بەرهەمی لێکۆڵینەوەکانیشـــی بریتی بوون لە دیاریکردن و پەنجەخستنە سەر دەرد و گرفتەکانی کۆمەڵگەی عێراقی و لەوێیشەوە بۆ تیمارکردنی گرفتەکان.

تیمــارکردنی ئەو بیمــارییــانەیش بەپێی دۆخی کۆمەڵگەکە دەبێت. بۆ نموونە چارەســـەری دەردی تایفەگەرێتی لە عێراقدا لای عەلی وەردی بریتییە لە سیستەمی دیموکراسی.

کەسی ئاگادار لە نوسینەکانی دکتۆر وەردی، توشی شۆک نابێت بە بینینی ئەو بارودۆخەی ئێستای عێراق لەڕووی هەبوونی ئەو گشتە ململانێیەی کە هەرجارەی بەشـــێوەیەک خۆی نمایش دەکات. جارێک بە ململانێی شــارســـتانییەت، جارێکیش بە دەوارنشـــینی و جارێکی دیکەیش بە خێڵگەرایی یاخوود ململانێی سیاسی.

---

العراق المســتقل، من ١٩٣٢ إلى ١٩٥٨: لێکۆڵینەوەیەک لە ســیاســەتەکانی عێراقی ( ١٩٨٠ز).

شخصيات عربية في السياسة ( ١٩٨١ز).

القانون في الشـرق الأوسـط: دەرکەوتن و بەرەوپێشـچوونی یاسـا ئیسـلامییەکان ( ١٩٨٣ز).

دول الخليج العربي: کۆمەڵە هەنگاوێک ڕووەو بەشداریکردنی سیاسی ( لەگەڵ جۆن پیتەرسۆن - ١٩٨٨ز).

حرب الخليج: دروستبوون و کاریگەرییەکانی ململانێی عێراق - ئێران ( ١٩٨٨ز).

الحرب في الخليج، ١٩٩٠-١٩٩١، ململانێی نێوان عێراق - کوەیت و کاریگەرییەکانی ( لەگەڵ ئیدمۆند غەریب - ٢٠٠١ز).

المفهوم الإسلامي للعدالة ( ٢٠٠٢ز).

**کارەکانی وەک پیاچوەرەوە (مدقق)**

الشريعة الإسلامية في الأمم : سير الشيباني ( ٢٠٠٢ز).

رسالة الشافعي: توێژینەوەیەک لە بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلامی.

ململانێکان بەهەموو شێوەکانییەوە لەم قۆناغەدا، خول خول دەچنەوە سەر ململانێ و شەڕەشەق لەسەر دەسەلات و کورسی.

وەردی دەڵێت: ئەو میراتە کۆمەلایەتییەی کە ئێستا لە عێراقدا باوە، دوو تایبەتمەندی هەیە، ئەوانیش:

دەمارگیری و خوێنی خێلایەتییە.

لەڕاستیشدا ئەو دووانە دوو ڕووی یەک دراون یان دوو کەرتی یەک سێون. خێلگەرایی دین نییە، بەلکوو مەیلێکی تایبەت یان دەمارگیرییەکە بۆ لای مەزهەبێک یان کەسایەتییەکی دیاریکراو. کەسی تائیفییش دەمارگیریەکی بۆ مەزهەبەکەی خۆی هەیە و هیچ گوێی لە بنەما ئەخلاقی و ڕۆحییەکان نییە، بۆیەیش دەمارگیرییەکەی دەبێتە شتێک لە دەرەوەی چوارچێوەی بیرکردنەوەی.

ئەوەی بەلای ئەوەوە گرنگە و سەری بۆی دەخوڕێت، دەمارگیرییە بۆ مەزهەبەکەی خۆی وەک چۆن دەشتەکییەک مەیلی بەلای خێلەکەی خۆیدا هەیە و دەمارگیرە لەبارەیەوە.

هەروەها وەردی دەڵێت:

نکۆڵی ناکەین کە ئەوەی لە عێراقدا لەماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا ڕووی داوە، لە هەر ولاتێکی دیکەی دنیایشدا ڕوو دەدات کاتێک بە قۆناغی لەدەستدانی هێزی حکومەتدا تێپەر دەبێت. بەلام ئەوەی عێراق جیا دەکاتەوە لە ولاتانی دیکە ئەو سروشتە دەوارنشینییە خێلەکییەیە کە هەیەتی.

فەرهوودکار و تالانچییەکان لە کاتی شالاوی فەرهودکاریدا یەکەمین شوێنێک کە ڕووی تێ بکەن، فەرمانگە و دەزگا حکومییەکانە وەک ئەوەی داخێک لە دلیاندا بێت و تۆلەی بسێننەوە. لەم کارەیشدا کەسانی ڕێک و پێک و بەڕێزیش بەشداری دەکەن لەگەل چەتە و

جەردەکاندا کە ئەوەیش بەئاشکرا نیشانەی ئەوەیە: ئەمە سروشت و بەهایەکی کۆمەڵایەتی لەمێژینەی باوی ناویانە.

## ژیاننامە

لە بەغدا لە ناوچەی کازمییە ســـاڵی ١٩١٣ی زاینی لە دایک بووە، لەســـــاڵی ١٩٢٤ خوێنـدنی بەجێ هێشـــتووە بۆ ئەوەی لە لای عەترفرۆشـــێک کار بکات، دواتر لەکارەکەی دوور خراوەتەوە لەبەر ئەوەی هەمیشـــە خۆی بە خوێندنەوەی کتێب و ڕۆژنامەوە خەریک کردوە و کڕیـارەکـانی فەرامۆش کردووە. پـاشـــتر، دووکـانێکی کردوەتەوە کە خۆی سەرپەرشتی کردوە.

لە ســـاڵی ١٩٣١ پەیوەندی بە خوێندنی ئێوارانەوە کردوە لە پۆلی شـەشـی سـەرەتایی دەسـتی بە خوێندن کردووە، ئەمەش سـەرەتای ژیانێکی نوێ بووە بۆ ئەو. پاشـــان خوێندنەکەی تەواو دەکات دەبێت بە مامۆسـتا. لەساڵی ١٩٣٢ جلو بەرگی باوی ئەوکاتەی خۆی گۆڕیی، جلو بەرگی ئەفەندی پۆشی.

پاش تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی پلەی یەکەمی لەسـەر ئاسـتی عێراق بەدەست هێنا و لەگەڵ کۆمەڵێک خوێندکاری دیکەدا بۆ خوێندن لە زانکۆی ئەمریکی بەیروت نێردرا. پاشـــان لەوێش بکالۆریۆســـی بەدەسـت هێنا و دواتر نێردرا بۆ زانکۆی تەکسـاس و لەوێ لە سـاڵی ١٩٤٨ ماسـتەری بەدەسـت هێنا و سـاڵی ١٩٥٠ ش دکتورای بەدەست هێنا کە دەقی هەردووک ماســـتەرنامە و دکتۆرانەمەکەشـــی لەلایەن هەمان وەرگێڕی ئەم کتێبەوە وەرگێڕدراوەنەتە سەر زمانی کوردی.

ئەو بەرپرسیارێتیانەی کە وەریگرتوون

لە سـاڵی ١٩٤٣ لە وەزارەتی مەعاریف وەک مامۆسـتای ئامادەیی ناوەندی بەغداد دامەزرا. لە سـاڵی ١٩٥٠ دا وەک مامۆسـتای زانسـتی

کۆمەڵناسی لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغداد دامەزراوە. پاشان لەساڵی ١٩٧٠ دا لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە. پاشان زانکۆی بەغداد نازناوی مامۆستای موتەمەڕیسی پێداوە.

چەندین کتێب و دانراوی گرنگی هەیە. دەربارەی عەلی وەردی، سلامە موسی، عبدالرزاق محی الدین نوسراویان هەیە و چەندین ڕۆژنامە و فەرهەنگی گەورە لەسەری نووسیویانە و چەندین نامەی ماستەر و دکتۆرای لەسەر هاتووە. لەکۆتایی حەفتاکاندا دەستی کرد بە نوسینەوەی یادەوەریەکانی خۆی لە دووتوێی کتێبێکدا .

کاریگەریی دانراوەکانی ئیبن خەلدون لە زانستی کۆمەڵناسیدا

عەلی وەردی لە زانستی کۆمەڵناسیدا لە ژێر کاریگەری ئیبن خەلدوندا بووە. بابەتیبوونی لەم بوارەدا بووە بەهۆی زۆر کێشەی گەورە. لەبەر ئەوەی بیرۆکەی مارکسیی وەرنەگرتووە و شوێنی بیرۆکە ئایدۆلۆژی و نەتەوەییەکان نەکەوتوو، ئیدی نەتەوەپەرستەکان بە مرۆڤێکی قوتری ناویان بردەوە.

## شیکارییەکانی لە ژینگەی عێراقی نوێدا

لێکۆڵینەوەکانی وەردی سەبارەت بە کەسایەتی تاکی عێراقی، لە گرینگترین توێژینەوەکان لەم جۆرە دێتە هەژمار و دەتوانێ وەکوو نموونەیەک بۆ خوێندنەوەی ناوچەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوین تماشا بکرێت.

وەردی کەسایەتی تاکی عیراقی وەک کەسایەتییێکی دو لایێنە هێنایە بەر چاو، کە هاوکات پیرۆزییەکان و باوەڕی بیابان و شارستانێتی تێدا بەدی دەکرێت. لەو ڕووەوە کە هەڵکەوتەی جوگرافی عێراق بووەتە هۆی ئەوەی لە لایێکەوە بە هۆی بوونی ڕووبار و سەرچاوەکانی دیکەی ئاو، شارەکان دەتوانن دروست بن و لە لایێکی

ترەوە بە هۆی نزیکی لە بیابانی عەرەبەوە، عێراق بووەتە نشینگەیەکی باش بۆ کۆچەرانی بیابانگەرد، کە دووایین نموونەی ئەم کۆچانە، بۆ ٢٥٠ساڵ لەمەوپێش دەگەڕێنەوە.

وەردی عێراق بە چەشـــنی کوورەی تـاواندنەوە دەبینێ کە بۆ ئـاوێتەکردنی کۆچەرانی بیـابـان بە دانیشـــتوانی عـێراق کە شارستانیەتێکی پێشکەوتووتریان هەبووە، بە کار دەبرێت. ئەم بابەتە بووەتە هۆی ئەوە دوو نەوە بە دوو پیرۆزیی و باوەری بیابانگەڕی و شــارسـتێنی دروســت بن، کە لە لایێکەوە شــانازی بە میوانداری و حەشیمەتی زۆر دەکەن و لەم لاشەوە ژیانی نێو شار ناچاری دەکات ڕێســای شــارســتانیەت ڕەچاو کات. وەردی بێجگە لە کورســتان، زۆرینەی نـاوچەکـانی عێراق دەخـاتە بەر توێژینەوە، بەڵام بە پێی دانپێدانانی لە کتێبی «خوێندنەوەی شـــیرازەی کۆمەڵگای عیراق» بە هۆی نەزانینی زمـانی کوردیەوە نەیتوانیوە ئەو کـارە بکـات. وەردی بێجگە لە ئیبن خەلدون، لە ژێر کاریگەری تێبینی بابەتیانە و ڕێڕەوی ژیرانەی «جاحیز»دا بووە لە خوێندنەوە کۆمەڵایەتی و دەروونناســی هەڵسووکەوتی مرۆڤدا سودی لێ بینیوە.

### بەرهەمەکانی بە زمانی عەرەبی:

١. شخصية الفرد العراقي
٢. خوارق اللاشعور
٣. وعاظ السلاطين
٤. مهزلة العقل البشري
٥. اسطورة الادب الرفيع
٦. الاحلام بين الحلم و العقيدة
٧. منطق ابن خلدون
٨. دراسة في طبيعة المجتمع العراقي

٩. لمحات اجتماعية في تأريخ العراق الحديث
١٠. الاخلاق
١١. هكذا قتلوا قرة العين.
١٢. لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث ٦ بەش.
١٣. الأحلام بين العلم والعقيدة.
١٤. قصة الأشراف وابن سعود

وەفات:

ئەم زانا بەڕێزە، لە ١٣ی تەمووزی ١٩٩٥ پاش ململانێیەکی سەخت لەگەڵ نەخۆشی و پاش ئەوەی پزیشکەکان بەهۆی نەبوونی دەرمانی پێویستەوە لە ئەنجامی ئابڵۆقە بەسەر عێراقی ئەو کاتەوە، نەیانتوانی چارەسەری بکەن، ئەویش بە مەبەستی چارەسەر ئۆغری کرد بۆ ولاتی ئەردەن تا بەشکو ئەمە خودایە دەردەکەی دەرمان بکات، بەلام بە دڵێکی ساردەوە گەڕایەوە بۆ ئەوەی لە عێراقەکەی خۆیدا کۆچی دوایی بکات.

جەنگی یەکەمی جیهانی وەک یەکێک لە گەورەترین کارەساتەکان کە بەسەر عێراقی هاچەرخدا هات.

ساڵی ١٩١٤، تورکەکان بانگەوازی نەفیری گشتییان دا و بە شێوەیەکی نائاسایی تەپڵ لێدرا و خەڵکەکە توشی شۆک بوون.

لەخۆباییبوون... کێشەی کەسانی سەرکەوتوو لە ژیاندا کە ئەو دۆخ و ڕێکەوتانە پشتگوێ دەخەن کە بۆیان هاتووەتە پێش.

بەغداد لەسەر دەستی ئینگلیز شکا و مەردووم شادوومان بوون کە لە دەستی تورکان خەلاسییان هاتووە.

ئەو یاداشتانەی خوێنەری بەڕێز کەمێکی دیکە دەیانخوێنێتەوە، هەروا یاداشتگەلێکی ئاسایی لەو یاداشتانە نین کە لە شوێنانی دیکە دەیخوێنێتەوە. بەندە هەر بەوەندە دەست هەڵناگرم چی ڕوویداوە بیگێڕمەوە و تەواو، بەڵکوو تەقالای ئەوە دەکەم شی و شرۆڤەیان بکەم و هۆکارەکانیان لەژێر چرای ئەو بیردۆزانەدا لێک بدەمەوە کە لە بوارە پسپۆڕییەکەی خۆمدا خوێندوومە.

ئەوجا نازانم بڵێم لە بەختی باشم یان ڕەشم، من پسپۆڕییم لە زانستی کۆمەڵناسی ودەروونناسی کۆمەڵایەتییدا هەیە؛ هەر بۆیەشە دەقم لەسەر ئەوە گرتووە، هەرچ ڕووداوێک بێت، بیم و تێڕوانینی خۆم لەسەر ئەو ڕووداوانە بڵێم کە پێیاندا تێدەپەڕم و بە ئەندازەی تاقەت و دەرەقەتهاتنی خۆم، شرۆڤە و لێکدانەوەیان بۆ بکەم. هەر ئەم نوختەیەشە وای لێکردووم ئەم یاداشتانە ناو بنێم (وانەکانی ژیانم) و، مەبەستیشم لەمە، وانەکانە فێریان بووم، تا ئەوەی یاداشت بن.

لە یاداشتنامەکانی دیکەدا، خەڵکی مشووری ئەوەیان خواردووە، فریای وەسف و سەنا و ستایشی خۆیان بکەون؛ یان نمایشی خۆیان دەکەن وەک ئەوەی بە ویست و حەزی خۆیان کەوتبنە مەیدانی

جەنگی دنیاوە. ئەمە بابەتێکە خوێنەران لەم یاداشتانەی منیشدا پەی پێ دەبەن.

منیش وەک ئەو گش خەڵکە حەزم لەوەیە بەخۆمدا هەڵبڵێم. بەڵام بیریش دەکەمەوە، هیچ دەسەڵاتێکم لە دروستکردنی خۆمدا نەبووە مەگەر لە چوارچێوەیەکی زۆر باریک و تەنگەبەردا. هەر بۆیە ئێستەکانێ کە گوزەرێک بە ژیانی منداڵیم تا پیرەمێردیمدا دەکەمەوە و تەماشایەکی ڕوداوەکان دەکەمەوە، لە زۆرینەی هەرە زۆری کاتەکاندا، خۆمم وەک پەڕێکی باڵندە بەدەم باوە دێتە پێش چاو.

دەشێ ڕووداوێکی چکۆڵەی بێکەڵک، یان قسەیەکی هەروا لەخۆوە گوتراوی بەدەم ڕێوە وێژراو، بەرز بەرز، یان نزم نزمی کردبێتمەوە بەبێ ئەوەی خۆم بە خۆم بزانم. ئەوەش زۆر بەئاسانی خوێنەر لەم بیرەوەرییانەدا هەستی پێ دەکات و دەیخوێنێتەوە.

یەکێک لە ڕۆژنامە عێراقییەکان بەر لە چەند ساڵێک، وتارێکمی بڵاو کردەوە، ئێرەش بە گونجاو دەزانم یادی بکەمەوە کە تێیدا نوسیبووم: (ئەگەر ئەنوەر پاشا لە جەنگی یەکەمی جیهانییدا لە تورکیا نەبووایە، ئەوا ئێستا من، یان لە یەکێک لە کوڵانەکانی کازمییەدا عەتتار بوم، یاخوود عەریزەنووس بووم).

کابرایەک دەپرسێت: داخۆ ئەنوەر پاشا لە ئاستانە (ئەستەنبوڵ) و عەلی وەردی لە کازمییە کوجا مەرحەبا؟ ئەنوەر پاشا لە دەورانی جەنگی یەکەمی جیهانییدا بەهێزترین کەسایەتیی ناوچەکە و عەلی وەردی خوردەساڵێکی بەغدایی لە کوڵان لەگەڵ هاوکوڵانییەکانی خەریکی گەمە بوو و، بێزاری و زەبوونی قەفاوقەفی دابوو! ئیدی چلۆن پەیوەندی لەنێوان دوو کەسی وەهادا دروست دەکرێت؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەڵێم: ئەنوەر پاشا دەسەڵاتی تەواوەتیی هەبوو لە تێوەگلانی عوسمانییەکان بە جەنگەوە، هەروەک لە بەشی

چوارەمی کتێبی (لمحات إجتماعیة فی تأریخ العراق الحدیث)، مانای ئەوەش ئەوەیە، ئەگەر ئەم کابرایە لە دەوڵەتی عوسـمانییدا نەبووایە، ئەوا نەدەچوونە جەنگەوە و عێراقیش لەسـەر دەوڵەتەکە پاش جەنگ ماوەیەکی کەم یان زۆر دەمایەوە.

دەبێت ئەوەشـمان بیر نەچێت، هەزارانی چەشـنی من، لە دەورانی دەوڵەتی عوسمانییدا بۆیان نەبوو بچنە خوێندنگە؛ بەڵکوو ئەو هەلەیان پاش دامەزرانیی دەوڵەتی نوێی عێراق بۆ ڕەخسا ئەو کاتەی فەیسەلی یەکەم[2] بوویە پادشا؛ دواتر دێینە سەر باسی ئەوە.

---

[2] - لە ساڵی ١٨٨٥ لە تائیفی سعوودیە لەدایک بووە. پاشان لە ساڵی ١٨٩٦ لەسەر داوای عەبدالحمیدی دووەمی سـوڵتانی عوسـمانییەکان، شـا فەیسـەڵی یەکەم لەگەڵ باوکی ڕۆشـتووە بۆ ئەسـتانەی پایتەختی عوسـمانییەکان و هەر لەوێش فێری زمانەکانی تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسـی بووە؛ باوکیشـی فێری خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزی کردووە.

لە ساڵی ١٩٠٥ هاوسەرگیری لەگەڵ حەزیمەی کچی مامیدا کردووە، لە ساڵی ١٩٠٩ باوکی فەیسـەڵی یەکەم کراوە بە شـەریفی مەککە، لە سـاڵی ١٩١٦ بە پشـتگیری بەریتانیا لەکاتی جەنگی کەنداوی یەکەم شـۆڕشـی لە دژی دەوڵەتی عـوسـمـانـی ڕاگەیـانـدووە، کە تـوانـی سـوپـای عـوسـمـانـی لە مەککە و مەدینە و تائیف و جەدە و یەنبع و عەقەبە دەربکەن.

لە ساڵی ١٩١٨ بەسەرکردایەتی شا فەیسەڵ هێزەکانی سووپای عەرەبی چونە خاکی سوریاوە و دەستبەجێ سوپای عوسمانی سوریای بەجێهێشت.

شا فەیسەڵیش دامەزراندنی حکومەتێکی عەرەبی لە دیمەشق ڕاگەیاند، لە ٨ مارسی ساڵی ١٩٢٠ کۆنگرەی گشـتی سـوریا سـەربەخۆیی سـوریایی لەژێر ناونیشـانی شانشینی سـوریایی عەرەبی ڕاگەیاند و شازادە فەیسـەڵیش کرا بە شـای سـوریا، بەڵام لە ڕۆژی ٢٤ هەمان مانگ فەرەنسا هێرشی کردە سەر سوریا و دیمەشقیان داگیرکرد و شـا فەیسـەڵیش دیمەشقی بەجێهێشت و گەیشتە لەندەن و شانشینی سوریا کۆتایی پێهات.

لە دوای شـۆڕشـی ٢٠ لە عێراق لە دژی داگیرکاری بەریتانیا، لە سـاڵی ١٩٢٠ بەئـامـادەبوونی ونسـتـۆن چرچڵی سـەرۆک وەزیرانی بەریـتـانـیـا کۆنگرەیەک لە قاهیرە سـەبارەت بەبارودۆخی عێراق بەسـترا و کۆنگرەکە ڕایگەیاند حکومەتی

شتێکی خۆش لەم بارەیەوە باسی بکەم ئەوەیە: ئەنوەر پاشا، لە ساڵی ١٩١٦ پاش سەرکەوتنی دەوڵەتی عوسمان لە جەنگی کوتدا، سەردانی عێراقی کرد و سەردانی مەزاری شەریفی لە کازمییە کرد، هەروەک ئەوەی چۆن سەردانی مەرقەدی ئیمان ئەبو حەنیفە و شێخ عەبدولقادری گەیلانی کرد. خەڵکیش بە هوتاف و چەپڵەڕێزان بەپیرییەوە هاتن هەروەک ئەوسا نەریت وابوو. منیش تەنها سێ دانە ساڵ بووم. کەچی نەمدەزانی ئەم کابرایەی ئاپۆڕەی مەردووم چەپڵەی بۆ دەکوتن، سەرەنجامی من و چەندانی وەک منی گۆڕیوە و کاریگەری لەسەر ژیانمان هەبووە. ئەوەش سوونەتی خودایە لە گشت کات و ساتێکدا کە مرۆڤ مەگەر لە سنورێکی دیاریکراودا، ئەگینا هیچ ڕۆڵێکی لە بنیاتنانی کەسایەتیی خۆیدا نییە.

زانستی هاوچەریش دەری خستووە، مرۆڤ بەرهەمی کارلێکەکانی نێوان دوو تاقم لە هۆکارە. یەکێکیان هۆکارە بۆماوەییەکانە و ئەوی دیکەشیان هۆکارە ژینگەییەکان. مرۆڤ بە کۆمەڵێ تایبەتمەندیی ڕوخسار و لەشولار و هێزی دەروونی و پێکهاتەی دەمارەخانە و هۆرمۆن و شتانی دیکەش... ئەم تایبەتمەندییانە لە منداڵییەوە کاریگەرییان لەسەر ژینگەکە جێدەهێڵن و پاشتر لە ڕووداو و

---

بەریتانیا سیاسەتی خۆی لە عێراق لە داگیرکارەوە دەگۆڕێتەوە بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی نیشتیمانی.

بەریتانیا ڕایگەیاند بەنیازی دامەزراندنی شانشینی عێراقە و فەیسەڵی کوڕی حسێنیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێتە شای عێراق و لە ١٦ یۆلیۆی ساڵی ١٩٢١ ئەلسێر بیرسی کۆکسی نوێنەری بەریتانیا ڕایگەیاند ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق بڕیاریداوە شازادە فەیسەڵ لەژێر سایەی حکومەتێکی دەستووری پەرلەمانتاری بکرێت بە شای عێراق و لەدوای ئەوەی لە ٩٦٪ دەنگەکانی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی بەدەستهێنا شازادە فەیسەڵ کرا بە شای عێراق.

شا فەیسەڵی یەکەم لە ١ سپتەمبەری ساڵی ١٩٣٣ گەشتێکی کرد بۆ سویسرا تاکو پشکنینی پزیشکی بۆ خۆی بکات، بەڵام لە دوای ٧ ڕۆژ، لە ٨ ـــی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٣ ڕاگەیەندرا کە بەهۆی وەستانی دڵییەوە کۆچی دوایی کردووە.

ڕێکەوتەکانی کە لە یانیدا پێیدا تێدەپەڕێت. ئەدی لێرەوە کەسایەتییەکەی چ خۆی بیهەوێ، چ نەیهەوێ، بنیات دەنرێ.

کێشەی هەندێک لە سەرکەوتووان ئەوەیە: توشی لەخۆباییبوون دەبن کاتێک سەردەکەون و وا دەزانن خۆیان بە ویست و حەزەری پێویستی خۆیان بەو ئاست و پێگەیە گەیشتوون. ئەو ڕووداو و ڕێکەوتانە نادیدە دەگرن لە ژیانیاندا توشیان بووە، هەروەک چۆن تایەتمەندییە بۆماوەییەکانیان بیر چووە کە کاریگەرییان لە فەراهەمهێنانی ئەو دۆخ و ڕێکەوتانەدا هەبووە.

کابرایەکی لەم شێوەیە دەناسم کە زۆر نابێت وەفاتی کردووە. ناوبراو زۆر بەخەستی بەخۆیدا دەنازی و وای هەژمار دەکرد خۆی وا خۆیی پێک هێناوە؛هەم زیرەک بوو، هەم کەشخە و پێکەوتە و لە بنەماڵەیەکی ناهەژار؛ خودا کردی و گەیشتە پێگەیەکی بەرزی دەوڵەتیش... ئیدی وەها خۆی لێ گۆڕابوو، لە ڕێگەبڕیندا عینجە و فینجەی دەکرد و بە فیزێکەوە پێی بە زەویدا دەنا.

ئەم کابرایە نیعمەتەکانی خودای بیر چووەتەوە کە بەسەریەوەیەتی وەک سیفەتە نوێیەکانی لە باوانییەوە بۆی ماوەتەوە و ئەوانەشی ...... تێیدا. لە ڕووی ئەو بارودۆخە لەبارەشەوە کە توایویەتی ئەو سیفەتە بۆماوەییانە بەباشی بخاتە گەڕ. هەر لە نزیکانی خۆی، کەسانی وا هەیە لە خێزانی هەژار و زەبوون گەورە بوون و لە خوردەساڵییەوە ناچار بوون بەشوێن ناندا وێڵ بن؛ هەروەک چۆن کەسانێکیشیان بەدەست ڕووخساری ناجوانەوە گرفتارن و تاقمێکی دیکەشیان بەدەست کەمئەندامی و هەبوونی کێشە لە زیرەکییاندا. ئەدی ئەمانە بە درێژایی زیندەگی لە هەوڵی بێهوودەدان و چش بە چی ناکەن.

مەردووم ڕاهاتوون ڕێزی سەرکەوتوو و بێڕێزی بە ژێرکەوتووان بکەن. وا گومانیان بردووە ئەم دووتاقمە خۆیان خۆیانیان بنیات ناوە. هەر ئەمەش وای کردووە چەندین ستەمی کۆمەڵایەتی بکرێت. لە

ڕاددەی پێویستی خۆی زیاتر ڕێزیان لە سەرکەوتووان و بێڕێزییان بە سەرنەکەوتووان کردووە گوایە ئەو داماوە خۆی بەرپرسی شکستی خۆیەتی.

ئاپۆرەی[٢] خەڵکی سەرزەوی وا خۆی لە پێنج ملیار کەس توند دەکات. هەر یەک لەم پێنج ملیارە چیرۆکێکی تایبەتی جیاواز لە هەر تاکێکی دیکەی هەیە لە هی کەس ناچێت.

## سەرەتای یادەوەرییەکانم

جەنگی یەکەمی جیهانی، یەکێک بوو لە هەرە گەورەترین کارەساتەکان کە توشی عێراقی هاوچەرخ بووە. قەدەریش وای خواستووە دەسپێکی ئەو جەنگە، من یەک ساڵ لە تەمەنم تێپەڕیبێت. هەر بۆیە یادەوەرییەکانی سەرەتام پڕن لە تەڵخی و تاڵی و ئێش کە لەبیرچوونەوەیان چەتوون بێ.

لە دەمی هەڵایرسانی جەنگدا، عێراق بەشێک بوو لە دەوڵەتی عوسمانی (وەک کەمێک لەمەوبەر ئاماژەمان پێدا). ئەوجا لە بەرەبەیانی ٣/ ئاب/ ١٩١٤، مەردووم بە دەنگێکی نائاسایی دەهۆڵی میری داچڵەکێنران کە دەوڵەت داوا لە گشت سەربازە مۆڵەتدراوەکانیش دەکات تا زووە خۆیان گورج بکەنەوە و پەیوەندی بە لق و تیپەکانی خۆیانەوە بکەن.

---

[٢] - ئاپۆرە: ژمارەی دانیشتووان.
شایەنی باسە، لە ئێستەیان خۆی لە هەشت ملیار توند کردووە و خودا دەزانێت تا چەند دەڕوات.

باوکی منیش جەواهیرفرۆش بوو، لە نزیک ماڵەکەمانەوە دوکانێکی هەبوو؛ یەکێکیش بو لەو سەربازانەی پشوو بوون و بانگەوازەکە گتبوونییەوە و دەبوو تا دەگوترێ یەک و دوو، پەیوەندی بکردایەتەوە بە لقەکەی خۆیەوە. بە چاوپرتاندنێک دووکانەکەی داخست و لە ماڵەوە خۆی شاردەوە کە ئەوە پیشەی هەموو ئەوانە بوو بانگەوازەکە گرتبوونییەوە.

دەوڵەت بەشوێن باوکمدا دەگەڕان بیبەن، کەچی باپیرەمیان گرت کە پیرەمێردێکی هشتا ساڵە بوو، پێیان وت تا کوڕەکەت خۆی ڕادەست نەکات، تۆ بە گیراوی دەمێنیتەوە. ئیدی بابم ناچار خۆی ڕادەست کرد. ئەویش لەگەڵ سەربازەکانی دیکە پەلکێشی بەغدا کران و بە کەشتیی دەریایی گەیەنرانە ئاوایی (المزیرعة) کە دەکەوتە کەنداوی عەرەب لە نزیک (القرنة). لەوێ جەنگێکی سەخت لەنێوان عوسمانی ئینگلیزدا قەوما و ئینگلیز بردییەوە و سەربازە عوسمانییەکان بەو ناوەدا پژان و هەندێکیشیان بە مەلە دایان لە کەنداوی عەرەب و زۆرێکیان نوقم و کەمێکیان بە سەلامەت لە ئاو پەڕینەوە کە بابم یەکێک بوو لەو کەمینەیە.

ئەو و ڕزگاربووەکان پەنایان بردە لای گەورەی هۆزی بەنی ئەسەد لە هۆزەکانی جەبائیش و لەوێ میوانی سەرۆکی هۆز، شێخ سالم ئەلخەییون بوون و لەوێشەوە بۆلای هۆزێکی دیکە.

سەرەنجام باوکم گەیشتەوە کازمییە لە کاتێکدا پرسەی بۆ دانرابوو. خۆی لە کونجی ماڵەوە قاییم کردبوو. بەختی باشی باوکم، ناوی لە لیستی کوژراوەکاندا بەناوی (الورد)ـەوە هاتبوو، ئیدی کەس بەدواییدا نەدەگەڕا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەترسا یەکێک خەبەری لێ بدا و دەنگوباسی بگاتەوە دەوڵەت. ناچار بەرەو نەجەف هەڵات.

نەجەف بێگوێیی خۆی بۆ دەوڵەتی عوسمانی لە ٢٢ی ئایاری ١٩١٥ ڕاگەیاند و لە دەوڵەتەکەی هاتبوویە دەرێ و دەوڵەتیش هیچ

سزایەکی بەسەردا جێبەجێ نەکردبوو چونکە شارێکی پیرۆز بوو و ئەگەر شتێکی لەو شێوەی کردبا، ڕەنگە دەنگوباسێکی خراپ دژی دەوڵەت بە جیهاندا بڵاو ببوایەتەوە. ئیدی لەوساوە نەجەف لەلایەن گەورە خۆجێیەکانی خۆیەوە بەڕێوە دەبرا و بووبوویە لانکەی ئەوانەی لە سەربازی هەڵدەهاتن. نەجەف پڕ بوو لەم جۆرە کەسانە و باوکی منیش یەکێکیان بوو.

باوکم لە دوکانی یەکێک لە جەواهیرفرۆشییەکان کاری دەکرد و هەر لەوێش ئۆتاقێکی بەکرێ گرتبوو کە دەکەوتە گەڕەکی (المشارق). پاشتر ناردی بەشوێن دایکم کە پەلی من بگرێ و بچینە نەجەف.

لەگەڵ دایکم بە ئەسپ و عەرەبانە ڕێگەی کەربەلامان گرتە بەر. لەوێش ڕا بە سواری گوێدرێژ گەیشتینە نەجەف. ئەوسا بەندە چوار ساڵم گوزەراندبوو. ئەو گەشتەش یەکەمین یادەوەریی دەورانی منداڵیکە کە هێشتاش لە یادگەمدا پارێزراوە.

لە نەجەف لەو ئۆتاقەدا نیشتەجێ بووبووین کە باوکم لە خانەکەدا بە کرێی گرتبوو. ئۆتاقەکە دەکەوتە ژووررووی دەرگای خانەکە. یەکێک لەو بیرەوەرییانەی هەرگیزم بیر ناچێتەوە ئەوەبوو: باوکم دەمانچەیەکی تەختەی بۆ کڕیبووم تا گەمە و گاڵتەی پێ بکەم، منیش هەروا لە نزیک خانەکەوە وەستابووم و یەکێک لە منداڵەکانی گەڕەک لێم نزیک بوویەوە و پڕی دایە دەمانچە و بەتاڵانی برد و تێی قوچاند... بینیم بە کۆڵانەکەدا هەڕا دەکات و شانازی بەو کارەوە دەکات کردوویەتی. ئەمنیش چوومەوە ژوورێ و هەم بۆ دەمانچەکە و هەمیش بۆ ئەو ستەمە دەگریام کە لێم کرابوو. ئەوە یەکەمین ستەمێک بوو کە لەم دنیایەدا لێم کرا. نەشمدەزانی شتی وەها لەم دنیایەی تێدا دەژین زۆر ئاساییە.

ماوەیەک لە نەجەف مابووینەوە کە بۆم دەخەملێنرا چەندە، بەڵام ڕۆژێکیان حەشاماتێکی زۆر و زەوەندی بێسنوورم بینی کە خۆشی

به هەموو گیانیانەوە دەدرەوشـایەوە. دواتر زانیم تومەز بەغدا بەدەستی ئینگلیز شکاوە و هۆی شادییەکەیان ئەوەیە. شکانی بەغدا مانای تەواوبوونی هەرچی زەحمەت و دەردەسەری و نەگبەتیی سەردەمی عوسمانی بوو. ئینگلیز دوو فەرماندەی بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکان ناردبوو. مەردوومەکە بە ژن و پیاوییەوە هاتبوونە پێشوازی ئەو فەرماندەیە. ئەمنیش لەگەڵ دایکم چووینە دەرێ. لە دەرەوەی نەجەف بەناو دنیایەک گوڕدا تێپەڕین. دڵخۆشی لە سەری خەڵکەکەوە دەرڕژا و وایان زانیبوو قۆناغ و شێوەیەکی نوێی ژیان کراوە بەبەریاندا و چیدی سەردەمی نەهامەتی کۆتایی پێ هاتووە.

ئاوارەکانی نەجەف هەرکەس بە هەرچییەوە هەیبوو، دەگەڕایەوە شار و زێدی خۆی، بەڵام ئێمە چووینە کوفە و لەوێشەوە سواری گەشتی بووین و گەیشتینە شاری (طویریج) کە ئێستەکانێ پێی دەڵێن (الهندیة).

ئەو کەشتییەی باری کربووین، لە ناوەندا بە پەردەیەک کرابوویە دوو بەشەوە، یەکیان بۆ پیاو و ئەوی دی بۆ ژنان. من لەبەر ئەوەی حسابی منداڵم بۆ دەکرا، دەمتوان پەردە لادەم و بە هەردوو لادا بێم و بچم. کاتێ گەیشتینە (طویریج)، سواری گوێدرێژ بووین و دواتر سواری کالیتە کراین و گەیشتینەوە کازمییە.

# ١

# ١٩١٧... نسكۆ و نەوەكانی سەردەمی نسكۆ

سەیید عەبدورەحمان گەیلانی فەرمانی بە خێزانەكانی كرد- ئەو دەمەی فڕۆكە بە ڕاسەریاندا تێدەپەڕێت- خۆیان داپۆشن و سەرپۆشەكانیان بەسەردا بدەن.

عێراقییەكان لەبارەی ئەو شتە تازەیەوە كە (كارەبا)ی ناو بوو، ببوون بە چەند پارچەیەكەوە؛ هەندێكیان دەیانگوت: ئەوە جنۆكەیە و یارمەتی ئینگلیز دەدات!

لە ١١ی ئازاری ١٩١٧، بەغدا كەوت و ئینگلیز بوویە ئاغا. بەم شێوەیەش سەردەمێكی نوێ دەستی پێ كرد و خەڵكی ناویان لێنا (سەردەمی نسكۆ) و بە منداڵانی ئەو دەمەشیان دەگوت (منداڵانی سەردەمی نسكۆ). لەم دەورەدا مەردووم شتانێكی سەیر و سەمەرەیان دەبینی كە نەیاندەزانی چۆنی ڕاڤە و لێكدانەوەیان بۆ بكەن. ئیدی دەستیان دەكردە گفتوگۆ و دەمەتەقێ لەبارەیانەوە و منیش هەندێك لە ئێواران باوكم دەیبردمە قاوەخانە و گوێم بۆ قسە و باسەكانیان شل دەكرد. زۆرینەی مقۆمقۆكانیشیان لەسەر ئەم چەند بابەتە بوو:

١. داهێنراوی سەیر و سەمەرەیان چەشنی فڕۆكە و كارەبا دەبینی كە لە سەردەمی عوسمانییەكاندا نەیانبینیبوو. ئیدی لەبارەی هۆكارەكانییەوە دەدوان و دەشیانپرسی: چۆن كافر دەتوانن ئەم شتانە دروست بكەن، كەچی موسوڵمان ناتوانێت؟

٢. فەرمانڕەوایەتیی ئینگلیزیشیان پێ دادپەروەرانەتر بوو لەوەی عوسـمانی. دەیانپرسـی: بۆچی کافر دادپەروەرە و موسـوڵمان ستەمگەر؟ باشە موسوڵمانی ستەمگەر باشترە یان کافری دادگەر؟

٣. ژنە ئینگلیزیان بە دانەپۆشـراوی دەبینی بەو بازاڕەدا دێت و دەچێت و لەگەڵ مەردووم قسـە دەکا و پێدەکەنێ. دەیانگوت: ئەو هەڵسـوکەوتانە لەگەڵ شـەرەف و پاکیزەیی ژناندا نایەتەوە؛ ئەگەر پیاوی ئینگلیز غیرەت و شـەرەف و ناموسـی هەبێ دێڵێت ژنەکانیان شتی وا بکەن؟

## حەقایەتی فڕۆکەکە

بەر لە جەنگ، خەڵکی فڕۆکەیان نەبینیبوو، بەلام لە سـاڵی ١٩١٠، یەکێـک لە ڕۆژنـامە عێراقییەکـان لەو بـارەیەوە هەواڵێکی پەخش کردبوویەوە. لە قاوەخانە گوێم لێبوو باوکم لەگەڵ دۆسـتەکانیدا چۆن سـەریان سوڕمابوو لە هەواڵەکە. ئەوجا لەو بارەیەوە چیرۆکێک هەیە شایەن بە گێڕانەوەیە:

باوکم لە سـەیید موحسـینی باوکییەوە دەگێڕێتەوە، تاقمێک لە یارانی بە مەدهۆشـییەوە هاتنە لای و هەواڵی ئەوەیان هێنابوو کە فەرەنگەکان عەرەبانەیەکیان دروسـت کردووە بە ئاسـماندا دەفڕێت؛ مەبەسـتیان پێ تەیارە بوو. ئەویش سـەرکۆنەی کردبوون لەسـەر ئەوەی باوەڕیان بە چیرۆکەکە کردبوو کە عەقڵ شتی وای پێ قەبووڵ ناکرێت. پێشـی وتبوون: (چۆن عەقڵتان شـتی وا پەسـەند دەکات عەرەبانەیەک بە ئاسماندا بفڕێنرێت؟) وەک خۆتان دەزانن عەرەبانە لە تەختە و ئاسـن دروسـت دەکرێت؛ لە چ عەقڵێکدا جێگەی دەبێتەوە تەختە و ئاسـن بە ئاسـماندا بفڕن؟ خودا عەقڵی بۆ بەکارهێنان خەلات کردووین! بۆ ئەوەشـی بەڵگە بۆ ڕاسـتی قسـەکەی خۆی بهێنێتەوە،

چەکوشێ لە پەنایدا بوو، ڕووی تێ کرد و وتی: (ئەی چەکووش بفڕە!) هەمدیس بە دەمی پڕ لە گلەییەوە ڕووی تێکردن کە چلۆن بڕوایان بە شتێکی عەقڵناپەسەند کردووە.

زۆر بەسەر ئەم چیرۆکەدا تێنەپەری، تەنها شەش ساڵ؛ خەڵکەکە بینییان وا عەرەبانەی ئینگلیز بە ئاسمانەوە بۆمبیان وەک باران بەسەردا دەبارێنێت. ئەدی باپیرم و زۆرێک لەو خەڵقەی دیکە، بە دەمی داچەقاوەوە هەر تەماشای ئاسمانیان دەکرد و یەک قسەشیان بۆ گۆ نەدەکرا.

هەر پەیوەست بەم باسەوە، یەکێک لە خێڵەکییەکانی دەوروبەری بەسرە، کە تەیارەی بینیبوو، خۆی پێ ڕانەگیرابوو، دەستی بە هۆرە کردبوو. لە هۆرەکەشیدا وتبووی: (خوداش وشتری خۆی هەیە).

ئەو تاکانەی هۆز کە ئەو جۆرە هۆرەیەیان دەکرد، بە هۆرەکەیان ئاماژەیان بۆ ئەو ئایەتە پیرۆزە دەکرد کە دەفەرموێت (أفلا ینظرون الی الإبل کیف خلقت). ماناکەشی ئەوەبوو: دەیانگوت: دروستکردنی فڕۆکە لە وشتر گەورەترە و بەو قسەیەیان تەحەددای خودایان دەکرد. ئەوان بیریان نییە خودا وەک چۆن وشتری دروست کردووە، باڵندەشی دروست کردووە. هەر ئەوەبوو توشی شۆک ببوون و خۆشیان نەیاندەزانی چی دەکەن و چی دەڵێن؟

لە سەردەمی نسکۆدا، بینینی فڕۆکە تەواو ئاسایی ببویەوە و هیچ سەرەسوڕمانێک یان پرسیارێکی بۆ دروست نەدەکردن. ئەمەش نەریتی مرۆڤە لە هەرشتێکی نوێیدا کە دواتر بۆی ئاسایی دەبێتەوە. لە سەردەمی عوسمانییشدا هەمان شت دەربارەی کەشتی و بەرق و ئامێری بەرگدروو و ترۆمبێل ڕوویدا و لەم دوادواییانەشدا لەبارەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە. جیاوازیی نێوان ئەستەم و لوواو (ممکن) لە

تێڕوانینی مرۆڤـدا، بریتییە لە جیـاوازیی نێوان خوپێوەگیراو و خوپێوەنەگیراو.

لەو هۆنراوانەی ئێمەی منداڵی سـەردەمی نسـکۆ دەمانووتەوە: (طیارة طارت فوق فیها مدامة). مەبەسـتیشـمان لە مدامة: مادام: خاتوونی ئینگلیزی بوو کە بە دانەپۆشـراوی لە بازاڕاندا دەمانبینین. ئەدی لەوساوە فڕۆکە و مادەم، ببون بە دوو شتی ئاسایی.

ئەوەی شـایەنی باسـە و پەیوەسـتە بەم مەسـەلەیەوە، گەورەی عەشیرەتی بەغد، سەیید عبدوڕەحمانی گەیلانی فەرمانی بە مێیینەکانی ماڵی خۆی کردبوو کاتێک فڕۆکە بە ئاسمانی ناوچەکەدا ڕادەبووڕێت، پێویستە خۆیان پۆشتە بکەنەوە نەبادا لە چاویلکەکانیانەوە تەماشایان بکەن. ئەو نەیـدەزانی نەوەکـانی وەک ژنە فەرەنگەکـان دواتر بەبێ سەرپۆش و حیجاب بە بازاڕادا پیاسە دەکەن.

## سەمەرەی کارەبا

گڵۆپی کارەبایی یەکێک بوو لەو سـەرسـوڕهێنەرانەی کە دەشـێ بوترێ هێندەی فڕۆکە لە سـەردەمی نسـکۆدا خەڵکی توشـی عەجباتی کرد لەپاش بینینی گڵۆپی نەوتی کە پێ دەگوترا (فانۆس یان چرا). ئەم چرایانە بە شەواندا لە کۆڵان و کوچەکاندا بە دیوارەوە دادەگیرسان و هەڵدەواسـران تا ڕێوگاران بەرپێی خۆیان ببینن و کەسـێکیشـیان بۆ تەرخـان دەکرا پێی دەگوترا (نەوتچی) کە نەوتی تێ دەکردن و پلیتەکەی دەگوڕین و سبەینانیش دەیانکوژاندنەوە.

بەڵام لە سـەردەمی نسـکۆدا جۆرە گڵۆپێکی دیکە داهات بەسـەر عەموودەوە دادەمەزران و خۆی دادەگیرسـا و دەکوژایەوە بەبێ

ئەوەی نیازی بە نەوت و نەوتچی هەبێت. هێزی ڕۆشـــناییەکەی چەند ئەوەندەی فانۆسەکان بوو.

ئەمە بابەتێکی دەرئاســـا بوو لای ئەمان. لەبارەشـــیەوە چەندین شـــێوە لێکـدانەوەیـان دەکرد. هەر تـاقمێکیش لە ڕووانگەی ئەو زانیارییانەوە شیکاریان دەکرد کە لەسەری ڕاهاتبوون.

گۆڤاری (العرب) کە ئەوســـا لە عێراق بڵاو دەبوویەوە، ناوەڕۆکی ئەو مونـاقەشـــــانەی خەڵکی بڵاو دەکردەوە کە لە بـارەی گڵۆپی کـارەبـاییەوە دەیـانکرد. تـاقمی وا هەبوون کـارەکەیـان بە جنۆکەدا هەڵدەواســی و دەیانوت: ئینگلیز توانیویەتی جنۆکە بۆ خۆی ڕام بکات و تـاقمێکی دیکەش دەیـانوت: ئەم کـارەبـایە بە لەدایکبوون لەداییـک دەبێـت هەر وەک ئەوەی نێرێـک و مێیەک پێـک دەگەن و وەچە دەخەنەوە.

گڵۆپە کارەباییە مێیەکان ئەوانەن بەســـەر عەموودەکانەوە دانراون و نێرەکانیش بەدەستی ئینگلیزەوەن و هەرکات بیانەوێت لە مێیەکانیان دەپەڕێنن.

تاقمی ســـێهەم دەیانوت: ڕووناکیی کارەبایی لە هەورەبریســـکەوە ئینگلیز توانیویەتی زەخیرەی بکـات و بیکـاتە نو گڵۆپەکـانەوە. چوارەمیش دەیانوت: لە دەریاکاندا باڵندەیەکی ڕووناک هەیە، ئینگلیز هاتوون و ئەوەیان بۆ خزمەی خۆیان ڕام هێناوە.

ئەو قســە و باســانەی گۆڤاری (العرب) لە ژمارە ٢ـــــی تشـرینی دووەمی ١٩١٧ بڵاوی کردووەتەوە، پێدەچێت هەر زادەی خەیـاڵی هەواڵنووسەکە بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێندەی من گوێم لە قسە و باسی خەڵکی بووبێت، شێوەی بیرکردنەوەکەیان مەگەر کەمێک، ئەگینا زۆر لەوە بەدوور نەبوو.

وەبیرمە یەکەمجار کە پانگەی کارەباییم بینی ئاوا بەدەوری خۆیدا خول دەخوات، هەڵەوداوان خۆم گەیاندەوە لای باوکم و لە هۆکەیم پرسی! وەڵامەکەی زۆر لەگەڵ ئەو شێوە وەڵامانەدا جیاواز نەبوو کە لە دەمی خەڵکم لە قاوەخانە دەبیست، بۆچی؟؟؟

لەناو ئەو پرسیارانەی مێشکی مەردوومەکەی سەخڵەت کردبوو: بۆچی ئەو فەرەنگە کافرانە دەرەقەی دروستکردنی وەها شتانێک دێن لە حاڵێکا موسوڵمانان توانایان زفتە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، خودا کردی و ئێوارەیەکیان لەگەڵ باوکم چووینە قاوەخانە و باس و خواسی ئەم پرسیارە قاوەخانەکەی قانگ دابوو.

یەکێک لە ئامادەبووان هەوڵی دا بابەتەکە بەم چەشنە شیکار بکات: ڕازی ئەم گشتە شتانە هەموویان لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر و ئیمامەکاندا هەیە، بەڵام موسوڵمانان لێی بێئاگان و کافران هاتوون دەیدۆزنەوە و لێی دەکۆڵنەوە و ئەم ئەنجامە زانستییانەی تێدا دەردەهێنن.

ئەم ڕایە بەلای هەندێکیانەوە پەسەند نەبوو، بۆیە یەکێک قسەکەی لەدەم وەرگرت و ووتی: فەرەنگەکان ئەهلی دنیان، بۆیە ئیبلیسیش لە دنیاکەیاندا یارمەتییان دەدات و ئیلهامی نهێنیی شتی لەو شێوانەیان دەخاتە مێشکەوە. بەڵام موسوڵمانان ئەهلی ئاخیرەتن و هەر ئاخیرەتیشیان بۆ باشترە لەم دنیا فانییە.

یەکێکی دیکە هەڵیدایە و وتی: فەرەنگەکان زینازادەن.. ئەوەتا ژنەکانیان ڕووت و قووتن و تێکەڵاویی پیاوی بێ دین و شەرەف دەکەن. دیارە ڕۆڵەی زیناش وەک شەیتانن و زۆر زیرەکن. هەر ئەوەش نهێنیی داهێنان و دروستکردنە سەرسوڕهێنەرەکانیانە.

ئەم جۆرە چەلەحانێیانە زۆری جیاواز نییە لەو شتانەی کە گۆڤاری (العرب) لەبارەی کارەباوە باسی کردبوو (وەک تۆزێک لەمەوبەر

باسمان کرد) که مرۆڤ هەر بەتەنها لە ڕێگەی بابەتە کۆنەکانەوە [خو پێوەگیراوەکانەوە] لە شتە نوێیەکانیش تێدەگات.

بە شێوەیەکی گشتییش عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت بەرەهایی لە شتێک بگات، بەڵکوو لە سـوورنگەی زانیاری و چەمکەکانەوە کە خوی پێوە گرتوون. ئەم نەریتە تەنها بە ڕەشـەخەڵک تایبەت نییە، بەڵکوو زانایان و فەیلەسوفانیش دەگرێتەوە.

لەبارەی (لۆرد کلڤن[4])ـی زاناوە دەگێڕنەوە: ئەو کاتەی بیستبووی فڕۆکە دروسـت کراوە، نکوڵیی کردووە و وتوویە: (فڕاندنی شـتانێکی لە هەوا سـوکەڵەتر لە ڕووی مادییەوە ئەسـتەمە و ببڕای ببڕ مرۆڤ ناگاتە ئەو توانا و دەرەقەتە).

ئەم هەڵوێسـتەی کلڤنی زانا هیچی لە هەڵوێسـتەکەی باپیری ڕەحمەتیم جیاواز نییە ئەو دەمەی دەنگوباسـی عەرەبانەی فڕیوی بۆ یەکەمجار بیستبوو.

---

[4] - لۆرد کیلڤن : زانایەکی سـەدەی نوزدەیە کە لە نێوان سـالانی ١٨٢٤ تا ١٩٠٧ ژیاوە. یەکەم کەس بووە کە ووشـە داینامیکە گەرمی (Thermodynamics) بەکار هێنـاوە. هەروەهـا پێوانەکردنی (پلەی کێلڤن)ـی داهێنـا کە یەکێکە لە یەکەکانی سیستەمی نێودەوڵەتی یەکە.

# ٢

# عوسمانلی گێلیۆرلەر

## عوسمانییەکان دێنەوە

ئیتتیحادییەکان هەوڵیاندا (پیاوە نەخۆشـــەکە) ببوژێننەوە و نەهێڵن بمرێت و توشیان بە توشی جەنگێکەوە کرد و خۆیان و ئەویشیان تیا بردا!

ســـــەربازە تورکەکان بەهۆی دواکەوتنی موچەکانیان لە دەوڵەتی باڵاوە بازاڕیان دەڕووتاندەوە!

پارە عوسـنـــمانییەکە کاغەزێکی بێ بەها بوو؛ تەنانەت بازرگانەکان داوایان لە کڕیارەکانیان دەکرد کاڵاکان بەخۆڕایی بەرن!

پـاش کەوتنی بەغـدا لەســـــەر دەســــتی ئینگلیز، لەنـاو خەڵکیـدا دەنگوبـاســـێـک بڵاو بوویەوە کە نـاواخنەکەی بریتی بوو لەوەی (عوســـمانلی گێلیۆرلەر) واتە عوســـمانییەکان بەم نزیکانە دەگەڕێنەوە عێراق و ئەوانەشی دەهۆڵیان بۆ ئەم دەنگوباسـە دەکوتا، ئەوانە بوون کە بیر و بەرژەوەندیکیان لە سەردەمی عوسمانییەکان و گەڕانەوەیاندا هەبوو. ئەمـانە نـازنـاوی (گێلیۆرلەر)یـان پێوە درابوو کە لە زمـانی تورکیدا بە واتای دێنەوە (دەگەڕێنەوە) دێت.

من لەو ســەردەمەدا خۆم بە کۆکردنەوەی سـککەی عوسـمانییەوە ســـەرقاڵ کردبوو کە چیدی لە بازاڕدا قیمەتیان نەمابوو. دەشـــچوومە

لای خزم و خوێشـــان و لەوێش ســـۆراخم دەکرد و بڕێکم جەم کردبوویەوە کە کەمیش نەبوو.

ڕۆژێکیان لە دوکانەکەی باوکم دانیشـتبووم، ڕێوگارێک بە بەردەم دووکـانەکەدا تێپەڕی و مزگێنیی گەڕانەوەی عوســـمانییەکـانی- بۆ عێراق- دەدا. گورجێ باوکم ئاوڕێکی بەلادا دامەوە و پرســـیاری ئەو برە ســـکەیەی لێ کردم کە جەمم کردووەتەوە و وتی: کە ئەوان گەڕانەوە، سودێکت پێ دەگەیەنن. بەو قسەیە زۆر دڵخۆش بووم بەڵام دڵخۆشـــییەکە هەدای نەدام و ســـودێکی ئەوتۆی پێ نەگەیاندم کە تێبینی ئەو ململانێ دەروونییەی دڵی باوکمم لەنێوان عوســـمانی و ئینگلیزدا دەکرد.

ئەو لەلایەکەوە زۆر ئیمانداربوو و پەرستشـێکی زۆری دەکرد کە دەبوو سـۆزی بەلای عوسـمانییەکاندا بجۆشـێت؛ دڵەکەی تریشـی ئەو ئازارانەی نیشـان دەدا کە لە سـەردەمی عوسمانییەکاندا چەشتبووی و ئەو ڕقەی بێدەنگ لە خۆیدا ئەسپەردە کردبوو.

ڕاســـتییەکەشـــی ئەوەبوو: زۆرینەی خەڵکەکە لەو بابەتەدا وەک باوکم بوون و بەدەســـت ئەو مقۆ مقۆ دەروونییەوە دەیـانناڵانـد. هەیانبوو لایەنە دینییەکە زاڵتر بوو و هەشیانبوو بە پێچەوانەوە.

## لە نموونەی ستەمی عوسمانی

ستەم لە سـەردەمی عوسمانییەکاندا گەیشتبوویە سنور و ئاستێک کە لە هیچ ســـەردەم و ڕۆژگـارێکدا پێی نەگەیشـــتبوو[°]. دەوڵەتی

---

° – دکتۆر وەردی لێرەدا مەبەستی پێ ئەو سـەردەمەی خۆیان بووە کە تێیدا ژیاوە و باوانی بۆیان گێڕاوەتەوە. و خۆی بۆ خۆی شایەتی هیچ سەردەمێکی دیکە نەبووە تا بەراوردیان بکات. بۆیەش هەندێک لە ڕەخنەگران ڕەخنە لە دکۆتر وەردی دەگرن

عوســـمانی بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی، بەهۆی پیری و خراپییەوە بە (پیاوە نەخۆشەکە) ناوی دەرکردبوو. ئەدی ئیتتیحادییەکان ویستیان گیانێک بە بەریدا بکەنەوە و شەڕ و گۆلمەزێکیان کرد بە ڕیشییەوە و خۆیان و ئەویشیان توشی فەرتەرات کرد.

لە منداڵیمدا زۆرم گوێ لە خەڵکی دەبوو باسـی سـتەم و گەندەڵیی فراوانی ســـەردەمی عوســـمانییان دەکرد. کە دواتریش هەندێک لە یاداشـــتی کەســـە هاوچەرخەکانم خوێندەوە کە تێکەڵاویی دۆخ و ســـەردەمەکەیان کردبوو، دەمبینی زۆر جیاواز نین لەو قســـانەی ڕەشەخەڵکەکە لە کۆڕە تایبەتەکانی خۆیاندا دەیانکرد.

خاڵە ڕەشـــەکانی دەوڵەتی عوســـمانی زۆرن و ژماردنیان کارێکی چەتوونە. بەڵام لێرەدا بەپێی ئەوانەی بیســـتوومن لە خەڵکەوە، یان لە یاداشتی خەڵکییەوە خوێندوومنەتەوە، باسیان دەکەم:

### ئەمەش چەند نموونەیەکە:

دەوڵەتی عوســـمـــانی بە شـــێوەیەکی ڕێـک و پێـک موچەی فەرمـانبەرەکـانی دابەش نەدەکرد. جـاری وا هەبوو مـاوەیەکی زۆر تێـدەپەڕی بەبێ ئەوەی هیچ موچەیەکیـان لە دەوڵەتەوە پێ بگـات. ئەوەش وای کردبوو هەندێک جار ســـەربازەکان پەلاماری بازاڕ بدەن و بەدەستی بەتاڵ نەگەڕێنەوە و ئەم کارەشیان ناو نرابوو (فەرهوود). فەرمـانبەرانی دەوڵەتیش ڕاهـاتبوون هیچ کـارێـک بەرەو پێش نەبەن

---

کە کاتێک بیهەوێ بەڵگە بۆ شـتێک بهێنێتەوە، پشـت بە کۆمەڵێک داتای نادروسـت و گشتێنراو دەبەستێت و دواتر بەڵگەکاریی نوختەی وردتری لێ دەکات. وەرگێڕ

مەگەر دوای ئەوەی خاوەن کارەکان بەرتیلی پێویستیان بە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەخستە مشتیانەوە.

مادام (دیو لافرا) لە یاداشتەکانیدا ئەو شتانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە گەڵ مێردەکەیدا ساڵی ١٨٨١ چوونەتە بەسرە. ئەو باسی ئەو شوێنە دەکات کە گەشتیارەکانیان تێدا کەرەنتینە دەکرد کە لە دەرەوەی عێراقەوە دەهاتنە ناو عێراق. باسی ئەوە دەکات ئەمان چۆن توانیویانە هەڵبێن. پاشان باسی خەڵکی بەسرە دەکات کە چۆن فەرمانبەرەکانی سەر کەرەنتینەکە ببونە ڕاوچیی پارە بەسەر خەڵکە گەشتیارەکەوە.

بە بەرتیل خەڵکەکەیان ئازاد دەکرد، یان دەستیان بەسەر کەل و پەلەکەیدا دەگرت یان خۆراکی بەسەرچوویان بە نرخی گران پێ دەفرۆشتن.

لە دەمی جەنگدا دەوڵەتی عوسمانی دراوێکی کاغەزی بەناو (نەوط)ـەوە دەردەکرد کە خەڵکەکە بەدەستییەوە ڕەنج بە خەسار ببوون. بەهاکەی لە بازاڕدا یەکسان بوو لە یەک لەسەر چواری بەها فەرمییەکەی. جاری وا هەبوو فەرمانبەرێک یان نەقیبێک دەچوویە بازاڕکردن و دراوێک لەو دراوانەی بە فرۆشیار دەدا تا نرخەکەی هەڵگرێت و باقییەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە.

فرۆشیاریش دۆشی دادەما و نەیدەزانی چی بکات! ناچار بوو کاڵاکەی بدات و باقییش بگەڕێنێتەوە بۆ کڕیارەکە کە سەرەنجام ئەم زەرەری دەکرد. ئیدی فرۆشیار ناچار بوو تکا لە کڕیارەکەی بکات کاڵاکە بەخۆڕایی یان بە قەرز ببات کە کەی توانی ئەوکات پارەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە.

سەربازیی زۆرەملێ یەکێک بوو لە هەرە ناخۆشترین شتەکانی ئەو سەردەمە. هەر بنەماڵەیەک کەسێکی لێ بە سەرباز بکرایە، ئیدی

شین و ڕۆڕۆیان دەگەیشتە کەشکەشانی فەلەک. ئەمان لەوە دڵنیا ببوونەوە کە هەرکەسێکیان لێ ببرێت، یان لە سەرمان دەبێتە شەختە، یان لە برسان دەتلێتەوە، یا بە برینداری نەرم نەرمێ گیان دەسپێرێ. ئەوان ئەزموونیان لەگەڵ ئەو جەنگەی پێشتردا هەبوو کە دەوڵەت توشی ببوو بە توشییەوە و خەڵکێکی زۆر و زەوند تیاچوون و فەوتان.

کێشەش لە سەربازگەکاندا ئەوەبوو: لەسەر بنەمای یەکشانی و دادپەروەری مامەڵەیان لەگەڵ سەربازەکاندا نەدەکرد. بەرتیل و واستە ڕۆڵێکی زۆر کارایان دەگێڕا. تەنها کوڕە هەژاری ماڵبەکۆڵ سەربازیی بۆ دەردەچوو؛ ئیدی بەچە زەنگین و وڕە ئاغا و قەراڵ بە جۆرێک لە جۆرەکان بەر لێبووردن دەکەوتن.

فەرمانگە دەوڵەتییەکان ناچار بوون دەست بەسەر هەندێک کەلوپەلی مەردوومدا بەناوی (پێداویستیی جەنگ) بگرن و لە بەرانبەردا قەواڵەیەکیان دانێ کە پاش تەوابوونی جەنگ نرخەکەیان دەدرێتەوە. بەڵام لە سۆنگەی ئەو ئەزموونە زۆرانەی هەیانبوو، تێگەیشتبوون کاتێک چاویان بەمانە دەکەوێتەوە کە وشتر هێلکە بکات.

ئەوەشی بۆ زیاد بکەین ئەو کەسانەی بەم کارە هەڵدەستان، شتیان بۆ خۆشیان بە شێوەیەکی زۆر ئابڕووبەرانە کۆ دەکردەوە.

## لە دوودڵیدا

ئەم چەرمەسەری و نەگبەتییانەی دامەنی مەردوومەکەی گرتبوو، وای لێکردبوون لە بەرانبەر دەوڵەتی عوسمانییدا تووشی دوودڵی ببن. دڵێکیان بەلای ئایین و پاڵنەرە دینییەکەدا دژی کافران و جەنگان لە

دژیان؛ دڵەکەی تریشـیان ویسـتێکی دنیایی پاڵی پێوە دەنان ڕقیان لە عوسمانییەکان بێت و حەز بکەن کافران باو بستێنن بەسەریاندا.

شـایەنی باسـە، ئەو زانایانەی بانگەوازی جیهادیان دەکرد، هەر بەوەندەوە نەدەوەسـتان بانگەوازەکە بکەن و تەواو، بەڵکوو خۆشـیان لە پێشـی پێشـەوە دەچوونە بەرەکانی جەنگ و ئەمەش وای لە زۆر سـەرباز کردبوو توشـی ململانێی دەروونی ببن و نەزانن چی بکەن. ئایا وەڵامی ئەو بانگەوازە بدەنەوە بۆ مەرگ لە پێناو خودادا یان لە کوشتن لەپێناو دەوڵەتێکی ئاوەها گەندەڵدا هەڵێن و چیدی سەربازییش نەکەن؟!

لە بەشـی پێشـوودا بینیمان چۆن نەجەف بێفەرمانیی خۆی بۆ دەوڵەتی عوسـمانی لە کاتی جەنگدا دەربڕیبوو و ببوویە هەوارێکیش بۆ ئەو کەسانەی لە سەربازی و جەنگ هەڵدەهاتن. سەرەڕای ئەوەی نەجەف ئەوسا و ئێستاش سەنتەرێکی دینیی گەورە بوو. زاناکانیشی پێشەوایانێک بوون کە پێشەوایەتیی بزووتنەوەی سەرخستنی دەوڵەتی عوسـمانییان دەکرد لە جەنگدا. بەڵام پێم ناڵێین چۆن تەبایی لەنێوان ئەم دوو دژییەدا دەکرێت؟؟

پاش قەیرێک هەلم بۆ ڕەخسـا و لەو بارەیەوە پرسـیارم لە باوکم کرد. گەر بیرتان بێت، پێشـتر وتم باوکم یەکێک بوو لە هەڵاتووەکان بەرەو نەجەف و لە هەمان کاتیشـدا یەکێک بوو لە دیندارەکان کە لە هەموو شتێکدا شوێنپێی زانایانی ئاینی هەڵدەگرت.

وەڵامەکەی بـاوکم ئەوەبوو: دەوڵەتی عوسـمـانی لە ڕوواڵەتـدا دەوڵەتێکی ئیسـلامی بوو بەڵام لە ناوەوەڕا نەئـ. ئەوجا دەسـتی بە باسـی ئەو نەگبەتی و تاڵی و ترشـییانە کرد کە ئەو و هەزارانی وەک ئەو بەدەسـت ئەو دەوڵەتە بەنـاوی بێ نـاوەڕۆک ئیسـلامەوە چەشـتوویانە. وتیشـی: کوڕە زەنگین و بەگەکان لە سـەربازی دەبەخشـران یان دەخرانە شـوێنێکی بێ خەتەرەوە. ئەوسـا ڕووی تێ

کردم و وتی: ئایا دەتەوێت خۆم لە پێناو دەوڵەتێکدا بەکوشت بدەم کە جیاوازی لەنێوان گەلەکەیدا دەکات؟ تۆ وەرە دەوڵەتێکی ڕاستەقینەی ئیسلامیم پێ نیشان بدە، ئەوجا ببینە چییان بۆ دەکەم؟

ئەو تەفسیرەی کە لە باوکمم بیست، وەک چارەسەری کێشەی ملململانێ دەروونییەکەیە کە باوکم و چەندانی وەک ئەوی پێوە دەتلایەوە.

هەر ئەو پرسیارەی کردم نابووم بە تەنگەی باوکمەوە، دام بە تەنگەی یەکێکیش لە مامۆشتا ئاینییەکان کە دەچوونە جیهاد و بانگەوازیان بۆ تێکۆشان دەکرد، بەڵام وەڵامەکەی ئەو جۆر و ڕەنگێکی دیکەی هەبوو. لە بڕوای ئەودا، ئەو زانایانەی هەستاون بە بانگەوازی جیهاد، هەستاون بە ئەرکێکی شەرعی خۆیان کە ئایینەکەیان داوایان لێ دەکات پشتگیری دەوڵەتی عوسمانی بن کە نوێنەرایەتیی ئیسلام دەکات دژی کافران و ئەرکی سەرشانیانە پشتیان لە هەموو کاتێکدا بگرن.

دەبێت ئەوەش تێبینی بکەین کە زانایانی ئاینی بەدەست دەردی سەربازییەوە وەک ئەو خەڵکە نەیانناڵاندووە، بەتایبەتی خەڵکە ڕەش و ڕووتەکە. ئەوان لە سەربازی بەخشرابوون. ئەوان کاتێکیش دەچوونە مەیدانی جەنگیشەوە، لەو شوێنانە بەدوور بوون کە تۆپ و زرم و کوتی بەر دەکەوت. دەوڵەت پلە و پۆستی باشی بە خۆیان و ئەوانەش دەدا کە لێیانەوە نزیک دەبوون. هەر ئەمەش هۆکاری ئەوەبوو خەڵکێکی زۆریان پێوە دەلکا تا لە خزمەتی سەربازی دوور بکەونەوە.

باوکم شتێکی بۆ گێڕامەوە کە پەیوەندی بەم مەسەلەیەوە هەیە و پوختەکەشی: ئەو کاتەی خزمەتی سەربازیی لەسەر پێویست کرا، ئەو و ئەوانەی لەگەڵی بوون، چوونە مەیدانێکەوە لە بەغدا تا گوێ بۆ وتارێکی دینی بگرن کە لە لایەن قازیی بەغداوە پێشکەش دەکرا. لەوێ بیستیان قازی وتارێکی پاراوی لەسەر واجبێتیی بەخشینی گیان و

خوێن لە پێناو ئایین و دژی کافراندا خوێندەوە. ئەوجا باوکم دەیگوت: ئێمەش سـوور دەمانزانی ئەم مەلایە واسـتە بۆ خزم و خوێش و دەر و دراوسێکانی خۆیان دەکات تا لە خزمەتی سەربازی ببەخشرێن.

مانای ئەم قسـەیە ئەوەیە: ئەو مەلایە داوا لە کوڕی خەڵکی دەکات خۆیان لەپێناو خودادا بەکوشـت بدەن، کەچی لەولاوە بۆ کوڕ و خزم و ئامۆزاکانی خۆی شەفاعەت دەفەرموێت و لە خزمەتیان دەبوورێت... لەپای چی؟

## ٣

# بەهەشت خانی جغان نییە؟

لە بەشـــەکانی پێشـــوودا باســـی ئەو بیرەوەرییانەم کرد کە هی سـەردەمی منداڵی و مێردمناڵیم بوون کە سـەردەمێکی نائاسـایی بوو بۆ خەڵکی، چونکە شـتانێکیان دەبینی پێی ڕانەهاتبوون و پرسـیاریان لەبارەوە دەکرد و مشـتومڕیان سـاز دەکرد. بەم بۆنەیەشـەوە توشـی ململانێی دەروونی دەبوون.

لێرەدا پێویسـتە ئاماژە بەو دۆخە کۆمەڵایەتییە نائاسـاییەش بکەم کەتێیدا گەورە بووم و بوویە هۆی لەدایکبوونی چەندین پرســـیار و ململانێی دەروونی لە سەرمدا.

لەم بەشـەدا هەوڵ دەدەم قسـە لەبارەی دۆخیماڵەوە و گەڕەک و شارەکەم بکەم کە ئایا زۆر و کەم چەندە کاریگەرییان لەسەر بنیاتنانی کەسایەتییم هەبووە؟

## دۆخی ماڵەوە

من تاقانەی دایک و باوکم بووم. نۆ خوشـــک و برام لە کاتی لەدایکبوونیاندا بە ماوەیەک، گشـــتیان وەفاتیان کردووە. لەو دەمەدا مردنی منداڵ شـــتێکی زۆر ئاســـایی بوو، بەتایبەتیش لە خانەوادە کەمدەستەکاندا.

ئێمە لە ماڵێکی ئاساییدا دەژیاین؛ بەڵام ماڵەدراوسێکەمان کۆشک و سەرایەکی هەرە گەورە بوو کە هی سەرۆکی شارەوانی (جەعفەر عەطفییە) بوو کە یەکێک بوو لە دەوڵەمەندەکانی شار و دەوڵەمەندترینیشیان بوو.

ئەوەی شایەنی باس بوو، دەروازەی ماڵی ئێمە و هاوسێ دەوڵەمەندەکەمان هاوبەش بوو. ئەدی هەندێک کەس کە دەیانبینی بەو دەروازەیەدا هامۆشۆ دەکەم، وایان دەزانی منیش دەوڵەمەندزادەم. بەڵام های لە ماڵی ئێمە و های لە ماڵی ئەوان.

بەڕێز جەعفەر سێ دانە کڵفەتی ڕەشپێستی هەبوو. یەکێکیان لەگەڵ ڕەشییەکەیدا قەڵەویش بوو و کاری چێشت لێنانی بەسەرەوە بوو.

دایکم بۆی باس کردبووم کە چۆن چۆنی لە ئەفریقا کە کچۆڵەیەک بووە فڕێنراوە و لە بازاڕی حیجاز فرۆشراوە و کاک جەعفەریش لەکاتی حەجدا کڕیویەتی و هێناویەتییەوە لای خۆی.

دوو کەنیزەکەی دیکە؛ هێندەی ئەم ڕەش نەبوون و شتێکیش لە جوانی و قەشەنگییان تێدا بوو. کاری ئەمان تایبەت بوو لەگەڵ خودی کاک جەعفەردا. مەسەلەن دەست هێنان بە شان و ملیدا.

بەڕێز جەعفەریش وەک سەرباقیی کەسە دیارەکانی ناوچەکە، هونەری خۆ نزیککردنەوە لە دەسەڵاتدارەکان باش شارەزا بوو. ئەوەش هونەرێکی گرنگ بوو بۆ کەسە دیار و ناسراوەکانی ئەو سەردەمە. کە ئینگلیزیش هاتن، هێندەی دەڵێی یەک و دوو، کاک جەعفەر بەیعەتی دانێ و خەڵات و سەوقاتیی گەورە و گرانی پێشکەش کردن. لە خەڵکم بیستەوە، پێشتر ئەم کارەی لەگەڵ عوسمانییەکانیش کردبوو.

منداڵانی کوڵان، سەرانی ئینگلیزمان دەبینی دەهاتنە ماڵەکەی کاک جەعفەر یان بێستانی نزیک ماڵەکەی و ئێمەش بە دەوروخولی سەیارەکانیاندا هەڵمان دەچیزکاند و لەناو میوانەکانیشدا ژنێکی ڕەقەکاری بەرزەمان دەبینی کە دواتر زانیمان ناوی (مس بێڵ) کە سکرتێری مەندوبی سامی، بەشی ڕۆژهەڵاتەکەی بوو. خۆم چاوم لێبوو دەچوویە ماڵی کاک جەعفەر و لەگەڵ دوو کچەکەیدا بە عەرەبی قسەی دەکرد و بە دەمیانەوە پێدەکەنی.

کاتێک دواتر یاداشتەکانی (مس بێڵ)م خوێندەوە، دیتم ڕێزێکی تایبەتی کاک جەعفەری لا بووە و بە یەکێک لە پشتیوانە گەورەکانی ئینگلیز لە عێراقی زانیوە. ئەو بیری چووە ئەم کاک جەعفەرە پێشتریش یەکێک بووە لە هەرە پشتیوانە گەورەکانی عوسمانی. یان زانیویشیەتی و وەک دەڵێن، خۆی لێ بوواردووە.

سەیری خۆش لەوەدا بوو، کاک جەعفەر و کۆمەڵێکی دیکە لە سەرانی نیشتمان، بۆ خۆحافیزی لە سەرکردە عوسمانییەکان کە بەدەستی ئینگلیز ڕووخابوون، چووبوون و پێشیان وتبوون: ئێمە دوای ئێوە ستەم و چەرمەسەری دەبینین. لە خودامان داوایە بەسەر کافراندا سەرتان بخات و دووبارە بگەڕێنەوە.

هەر ئەم سەرکردانە چوونە پێشوازی سەرکردە ئینگلیزەکان دوای گرتنی بەغدا و تەواو پێچەوانە دەدوان و قسەکانی یەک ڕۆژ پێشتریان بیر چووبوویەوە کە بە عوسمانییەکانیان وتبوو.

ئەمەی لەکوێوە با هەڵکات، لەوێوە شەن بکەیت، لە نەریتی ئەوسای ئەو خەڵکەدا شوورەیی نەبووە، بەڵکوو نەریتێکی خوپێوەگیراو و پەسەندی لای زۆرێک لە خەڵکەکە بووە.

شایەنی باسە، ئەم گەورانەی کە خۆیان لە دەسەڵاتدارەکان نزیک دەکردەوە، هاوکات لە بەرانبەر خەڵکە ڕەش و ڕووتەکەدا یان ئەوانەی

پێگەی کۆمەڵایەتییان لەمان خوارتر بوو، فوویان کردبوویە خۆیان و خۆیان بە گەورە دەزانی. ئەمەش بەتەواوی لە هەڵسوکەوتەکانی کاک جەعفەردا دەرهەق بە هەژار و دەر و دراوسێ دەبینرا.

ئەو دۆخەی کە خەڵکی بۆ ماوەیەکی زۆر تێدا مابوویەوە، کارێکی کردبوو، هەمووان بۆ لە خۆیان سەرووتر پان بکەنەوە و ماستاو بکەن و دەرهەق بە خواری خۆشیان، هەرچی کیبر هەیە خەرجی بکەن. لە خۆنزیککردنەوەکەیدا بەرژەوەندیی خۆی دەپاراست و لە بە کەم تەماشاکردنەکەشیدا پارێزگاری لە پێگە کۆمەڵایەتییەکەی دەکرد.

## باروبۆخی کۆڵان و گەڕەک

ماڵمان کەوتبوویە نێوان دوو گەڕەکی لێک جیاواز لە ڕووی کۆمەڵایەتی و بەها کۆمەڵایەتییەکانەوە. ئەوانیش گەڕەکی شێخان و ئەنبارییەکان بوو. دەروازەی ماڵەکەمان بە ڕووی گەڕەکی شێخەکاندا لە کاتێکدا پەنجەرەی پشتەوەمان بە ڕووی ئەنبارییەکاندا ئاوەڵا بوو. منیش تاوێ لەگەڵ شێخییەکان و تاوێکیش لەگەڵ ئەنبارییەکاندا گەمەم دەکرد.

جیاوازییەکی زۆر لەنێوان بەها کۆمەڵایەتییەکانی ئەم دوو گەڕەکەدا هەبوو. گەڕەکی ئەنبارییەکان بابەتی تۆڵە و ژنانی دانەپۆشراو و ئابڕوو شۆردنەوەیان تێپەڕاندبوو، لە کاتێکدا گەڕەکی شێخەکان ئافرەتان زۆر بە توندی خۆیان دادەپۆشی و تاک و تەرایەکیش ئابڕوو سڕینەوە و تۆڵەی تێدا مابوو.

هۆکاری جیاوازیی نێوان ئەو دوو گەڕەکەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی: ئەنبارییەکان ماوەیەکی کەم بوو لە کازمییە نیشتەجێ ببوون کە پێشتر لە کەنارەکانی ئەنبار کە دەکەوتە سەر فوڕات نیشتەجێ

ببوون و ناوەکەشیان هەر لەوەوە هاتبوو. هەر بۆیە دەستیان بە بەها خێڵەکییەکانی خۆیانەوە گرتبوو.

گەڕەکی ئەنبارییەکان تاکە گەڕەک نەبوون کە بەم تایبەتمەندییە ناسرابن؛ گەڕەکی هاوشێوەی دیکەش لە بەغدا هەبوون. ڕاستییەکەی ئەوەبوو، زۆرینەی گەڕەکە کەنارییەکانی بەغدا لە هەردوو لای کەرخ و ڕەسسافەوە هەمان شێوە و نەریتیان هەبوو. ئەمان ئەوانە بوون کە دوای تاعوونەکەی سالّی ١٨٣١ -کە دای لە بەغدا و کازمییەی سێ یەکی خەڵکەکەی لەناو برد- مابوونەوە.

یەکێک لەو جیاوازییانەی لەنێوان ژنانی ئەنباری و ژنانی گەڕەکەکانی دیکەی کازمییە سەرەنجی ڕادەکێشام ئەوەبوو: ژنە ئەنبارییەکان بەو شێوەی خێڵەکی خۆیان سافیرە بوون کە ئەوەش ئەوەیە ئیسلام داوای دەکات. واتە دەرخستنی ڕووخسار و دوو دەست. بەڵام ژنانی گەڕەکەکانی دیکە، لە کاتی چوونە دەرەوەدا دوو عەبایان دەهێنا، یەکێکیان بۆ سەر شانیان و ئەوی دیکەش بۆ سەر سەر کە تەنها درزێکی بارێکی تێدا دەمایەوە و لەوێوە دەرەوەیان دەبینی.

دانەپۆشراویی ژنە ئەنبارییەکان وەک دانەپۆشراویی ژنانی دەرەوەی شار بوو، کە لە بەرانبەریدا شۆڕدنەوەی ئابڕوو هەبوو. واتە نەریتی ژن کوشتن لەو کاتەی گومانی ڕەوشتی لێ دەکرا. ئەم نەریتە لە گەڕەکەکانی تردا بەو شێوەیەی لای ئەنبارییەکان باو بوو، باو نەبوو.

ڕۆژێکیان ژنێک لەو ژنانەیان ناوبانگی باشی لێ بڵاو نەبووبوویەوە، کەسیشی نەبوو بیکوژێت تەنها برایەک نەبێت کە هێندە منداڵ بوو، هێشتا شەیتانی نەبووبوو، واتە باڵغ نەبووبوو. گەورانی گەڕەک کۆبوونەوەیەکیان ساز کرد و تێیدا هەموو یارمەتییەکیان بۆ کوڕەکە ڕەچاو کرد. ئەویش کە کارەکەی تەواو کرد و خۆی ڕادەستی

پۆلیس کرد و دواتر دادگا ئازادی کرد و گەڕایەوە و، خەڵکەکەش بەچاوی ڕێز و یارمەتیی زۆرەوە تەماشایان دەکرد.

سەیر و سەمەرەی گەڕەکی ئەنبارییەکان ئەوەیە، ژنەکە خۆی لەسەر شێوەی قەراخشارییەکان پۆشاک لەبەر دەکات، کەچی کچەکەی تەواو داپۆشراوە و ئەمەش تومەز شوی بە کوڕی گەڕەکەکەکانی دیکە کردووە. پاش قەیرێک، نەوەی ژنەکەم بینی بە دانەپۆشراوی، بەڵام دانەپۆشراویی هاوچەرخ نەک قەراخ شاری و ئیسلامییەکە. واتە قولە ڕانەکانی و گەردەنی، ئەوە بێجگە ڕوومەتی کە بەدەرەوە بوو. ئەویش وەک کچانی سەردەمی خۆی ملی بۆ ئەم شەپۆلە نوێیە کەچ کردووە و بیری دایک و نەنەی خۆی نەماوە ئەوان چۆن بوون.

ئەم گۆڕانکارییە لە دۆخی ژناندا، بە گشتی ئەو گۆڕانکارییانەمان نیشان دەدات کە عێراق بەخۆیەوەی بینیوە. ئەم گۆڕانکارییانەش دەبێت پڕ بێت لە کێشە و گۆڵەمز هەروەک لە بەشەکانی داهاتوودا دێینە سەر باسیان.

## بارودۆخی شار

ناوچەی کازمییە، ئەو شوێنەی تێیدا گەورە بووم، نزیکەی پێنج میل لە باکوری بەغداوە دوورە. لە نێوان کازمییە و بەغداشدا عەرەبانە لەسەر سکە دانراون کە ئەسپ ڕایان دەکێشن و پێیان دەگوترێت (ترامواى) کە بڕینی مەوداکەی چل خولەک دەخایەنێت.

کاتێک بەراوردی کازمییە و بەغدا لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە دەکرێت، بۆشاییەکی زۆر دەبینرێت. کازمییە شوێنێکی پیرۆز و مەزارێکی پیرۆزی شیعەیە و خەڵکی لە گشت لایەکەوە سەردانی دەکەن. زانا و دەرسخانەی زۆری تێدایە. بەڵام بەغداد لەگەڵ ئەوەشی

پایتەختی وڵات بوو، سەنتەرێکی شارستانییەت و بیر و دەزگا هاوچەرخەکانیش بوو.

کازمییە یەکێکە لە چوار زەوییە پیرۆزەکەی عێراق. هەرچەند لە سیانەکەی دیکە کەمێک جودایە چونکە لە بەغداوە نزیکە، ئەوەش وای لێکردووە ببێتە لانکەی ململانێی هەردوو جەمسەری هاوچەرخ و کۆن، یان ئایین و شارستانییەت. منیش وەک خۆم، زۆرم بەدەست ئەم ململانێیەوە چەشتووە.

ئەو دەمە دانیشتووانی بەغدا خۆی لە ٢٠٠ هەزار کەس توند کردبوو، لە کاتێکدا دانیشتووانی کازمییە ١٥ هەزار بوون، خەڵکی کازمییە لەبارەی بەغداوە دەیانگوت: گەر فیل بەرێتە بەغدا ون دەبێت. خۆی دەنگوباس وا بڵاوە فیل ڕێگەی خۆی ون ناکات، بەڵام لەبەر قەرەباڵغی و فراوانییەکەی، تێیدا ون دەبێت.

لە منداڵییمدا باوکم بۆ سەردانی هەندێک لە جەواهیرفرۆشییەکان دەیبرمە بەغدا. ئەو دەمەش جەواهیرفرۆشییەکان هەموویان لە یەک خاندا دەورە درابوون کە دەکەوتنە لابەلای ڕەسافە، نزیک پردی کۆن کە پێی دەگوترا (خانی جغان). خانێکی بەناوبانگ بوو و چەندین دوکانی تێدا بوو؛ بێجگە جەواهیرفرۆشی هیچ دوکانێکی دیکەی تێدا نەبوو و گش خاوەنەکانیشیان جوو بوون.

لە قسە زۆر باوەکانی ئەو سەردەمە ئەوەبوو دەیانگوت: (خۆ بەهەشت خانی جغان نییە). مەبەستیشیان لەو قسەیە ئەوەبوو: بەهەشت بۆ هەموو کەس کراوە نییە وەک ئەوەی هەرکەس بیهەوێت دەتوانێت خۆی بە خانی جغاندا بکات. بەڵکوو بەهەشت تایبەتە بە کۆمەڵێک کەسەوە.

خودا کردی و جارێکیان بۆم هەڵکەوت لە باوکم بپرسم: ئەو تاقمە کێن کە بەهەشت تایبەتە پێیانەوە؟ وەڵامی دامەوە کە (خۆمان). منیش

بڕوام بە وەڵامەکەی کرد. بەڵام پاش عەیامێک بۆم دەرکەوت، هەر تاقمێک لە هەر گۆشەیەکی سەر زەوییدا خۆیان بە خاوەنی ئەو مافە دەزانن. قورئانیش لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (هەر بەرەیەک بەوەی لای خۆیەتی خەنییە).

باوکم پیاوێکی هەم ئیماندار و هەمیش پەرستشی زۆری دەکرد- وەک پێشتر ئاماژەم بەوە دا. سەریشی لەناو کتێبە پەرە زەردەکاندا بوو. دەمی پڕ لە رەخنە بوو بەرانبەر ئەم بیرۆکە هاوچەرخانە کە گومان لە بوونی خودا و توانای دەکەن. ڕا هاتبوو هەرکات باران بە لێزەمە تێی دەکرد، سەری بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە و ئۆف ئۆفی دەکرد لە دەست ئەم فەرەنگییانە کە وتبوویان باران لە هەڵمە.

شایەنی باسە، هەر لەو ماوەیەدا کتێبێک لەلایەن زانایەکی ئاینییەوە نوسرابوو بە ناونیشانی (السیف البتار علی الکفار لمن یقولون المطر من البخار) (شمشێری بڕەر دژی کافران، ئەوان دەڵێن لە هەڵمەوەیە باران). ڕۆژێکیشیان بینیم کابرایەک بەر ببوویە گیانی کابرایەکی دیکە بە بیانوی ئەوەی وتبووی لە هەڵمەوەیە باران.

کێشەی من لەوەدا بوو، هەر لە لاویمەوە لە ڕیزی فەرەنگییەکان بووم، ئەوانەی باوکم ڕەخنەی لێ دەگرتن. بەغداشمان لێوە نزیک بوو؛ هەر ماوە نا ماوەیەک دەچووم و کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەم دەهێنایەوە. لە بەشەکانی داهاتوودا سەرەنجامی ئەم کارانە دەبینین.

٤

# میر فەیسەڵ حوسێن لە بەغدا

**شکۆمەندکردنی دەسەڵات لە ڕۆژی غەدیر و دانرانی عەلی وەک جێنشین**

**مەلیک فەیسەڵی یەکەم بەدەست سیاسەتی ئینگلیزەوە دەیناڵاند و ئەوەش یەکێک بوو لە هۆکارەکانی جوانەمەرگبوونی**

لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٢١، میر فەیسەڵی کوڕی حوسێن گەیشتە بەغدا بەو مەبەستەی بکرێتە مەلیکی عێراق کە لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرابوو.

بەخێرهاتنێکی فرە گەورە و بەرفراوانی لێ کرا. بۆ ڕۆژی دواتر، مەلیک بە مەبەستی زیارەتی مەزاری پیرۆز، سەردانی کازمییەی کرد. لەوێش هەمدیس بەخێرهاتنێکی گەرمی لێ کرا. دوو ئاهەنگیشی بۆ گێردرا، یەکێکیان لە ماڵی سەیید موحەممەد حەسەن سەدر و ئەوی دیکەیشیان لە ماڵی حاجی عەبدالحسین چەلەبی. ئەدی هۆنراوە و وتاری بەخێرهاتنی هەمەچەشن هەر بەو شێوەیەی کە لەو سەردەمانەدا باو بوو، خوێنرانەوە.

کاک جەعفەر داخی زۆری خوارد کە مەلیک چووەتە ماڵی ئەو دووانە و ماڵەکەی ئەمی نەکردووە بە سێهەم. بۆ ئەو مەبەستە شکاتی حاڵی خۆی گەیاندە لای (مس بێڵ).

(مس بێڵ) لە نامەکانیدا دەڵێت: سەیید جەعفەر پەژمووردە ببوو، هات لام و دەیوت: شەرەفم لەبەردەم خەڵکەکەدا شکێنراوە. ئەویش وەڵامی دابوویەوە: "نیگەران مەبە، هەستە و بچۆ داوەتی چایەکی بکە، منیش سوپاسالار و مەندوبی سامی دەنێرمە لات".

سەیید جەعفەریش چۆن ڕێنمایی کرابوو، وای کرد و مەلیکیش بەدەنگ بانگێشتەکەیەوە هات و چا خواردنەوەکەیان خستبوویە دەمەوعەسری ١٦ی ئابی ١٩٢١. سەیید جەعفەریش لە شیرینی و میوە و دیاریی گرانبەها کە دواتر پێشکەشی فەیسەڵ و مەندوبی سامی و سوپاسالار و بێگومان مس بێلیشی بکات.

دەنگوباس وا بڵاو بوو، سەیید جەعفەر ٦٠ هەزار ڕۆپیەی خەرج کردبێت. ئەو برەش بە پێوەرەکانی ئەو سەردەمە، هەر زۆر زۆر بووە. دەنگوباس وایە، کە مەلیک گەیشتووەتە بەرماڵیان، چەمیوەتەوە دەستەکانی ماچ بکات. مس بێڵ لە یاداشتەکانیدا لەبارەی سفرە و خوانەکەی سەیید جەعفەرەوە دەڵێت: (ببڕای ببڕ خوانی وا پڕ لە شیرینی و میوەی نەبینیوە).

بەم بۆنەیەوە، پێگە و جێگەی سەیید جەعفەر لەچاوی دەسەڵاتداراندا زۆر بەرز بوویەوە؛ ئەوە با چاوی ڕەشە خەڵک بوەستێت. ئیدی سەرۆکشارەوانی بوویە هی خۆی و کەس نەیدەتوانی ڕکابەریی بکات. ئەوەش تاقە شتێک بوو کە سەیید جەعفەر چاوی تێ بڕیبوو. تاکە مرازی دڵی ئەوەبوو: لە سەردەمی فەیسەڵیشدا ببێتە سەرۆکی شارەوانی هەر وەک چۆن لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بوو. خواش بە مرازی دڵی کرد!

## ڕۆژانی سەرەتا

دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی مەلیک فەیسەڵ دەستی پێکرد و ئەنجامەکەشی هەر بەو شێوەیە بوو کە چاوەڕێ دەکرا. ڕاستییەکەی مەردوومی عێراق زۆریان خۆش دەویست. کەسایەتییەکی خۆشەویستی هەبوو، بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ دەکردن کە حەزیان لێی بوو یان لەگەڵیان دەگونجا.

بڕیار درا مەراسیمی تاج لەسەرنانەکە بکەوێتە ٢٣ـی ئابی ١٩٢١. ئاشکراشە مەلیک خۆی ئەو ڕۆژەی بۆ ئەو کارە دیاری کردووە کە ئەوەش هاوکات بوو لەگەڵ ١٨ـی زی حەججە بەپێی ساڵژمێری مانگی کە دەیکردە ساڵیادی (جەژنی غەدیر)ی شیعە.

شیعە بڕوایان وایە لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خودا (درود و سەلامی لەسەر بێت) عەلی کوڕی ئەبو تالیبی کردووەتە جێنشینی خۆی. فەیسەڵیش بەم کارەی دەیویست خەڵکەکە تێبگەیەنێت کە لە نەوەی ئیمام عەلییە و لە خۆشەویستانییەتی و لەسەر ڕێبازەکەشی هەنگاو هەڵدێنێت.

پاش دوانزە ڕۆژ لە پرۆسەی تاجگوزاری، داخلی مانگی موحەڕڕەم بوون کە لەو مانگەدا شیعە یادی شەهیدکرانی ئیمام حوسێنی کوڕی عەلی دەکەنەوە. کۆڕی پرسە و زنجیرکوتین و خۆ ڕنین دەست پێدەکات. مەلیکیش بڕێک داهاتی بۆ ئەو پرسە و زنجیرکوتینە تەرخان کرد. هەروەک چۆن فەرمانی دەرکرد لە کازمییە بەناوی ئەوەوە پرسە رابگەیەنرێت. مەلیک خۆشی لەوێ لە نێوان زانا ئاینییەکاندا بەشدار بوو.

لە ڕۆژی عاشورا، واتە دەهەمی مانگی موحەڕڕەم، هەر لە بەیانی زووەوە تەختی کازمییە پڕ دەبێت لە خەڵک و شێوەی کوشتنەکە نمایش دەکەن و پرسە و دڵتەنگی ڕادەگەیەنن و ...

مەلیک خۆی لەو ڕۆژەدا لەگەڵ دار و دەستەکەی ئامادە بوو کە لە نێوانیشیاندا (ساطع الحصری) لە یاداشتەکانیدا ئاماژەی بەو ڕۆژە داوە.

تەخت و تاراجێک -کە دەکەوتە ژێر مەیدانەکە و سەر دەرگای ڕووەو قیبلە - بۆ مەلیک ئامادە کرا، ئەویش بە خۆی و دەستە و دایرەکەیەوە دانیشتن. دەستەی پرسەگێڕانیش بە پێش چاوی ئەودا ڕادەبووردن و ئەویش هێمای کرد کە دیاری و خەڵاتی بە نمایشگەران و پرسەگێڕان ببەخشرێ. ئەو ڕۆژە منیش لە پەنا باوکم ئامادە بووم. خەڵکەکە تەماشای نمایشی کوشتنەکەیان دەکرد و لەبەر خۆشیانەوە دەیانگوت مەلیک لەوێیە و یەکەمجاریش بوو لە مێژوودا ئاڵای عێراق لە پرسەی حوسوێنییەکاندا هەڵ بکرێت.

ئەو دەمە هێشتا ئەو ئاڵایە نامۆ بوو و هەندێک کەسیش بە شایستەیان نەدەزانی لە حوسەینییەکاندا هەڵ بکرێت لەبەر ئەوەی یەکەمجار شەریف حوسێن هەڵیکرد ئەو کاتەی لەگەڵ مافران دەستی تێکەڵ کرد بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانیی ئیسلامی.

(ساطع الحصری) لە یاداشتەکانیدا دەگێڕێتەوە دەڵێت: کاتێک نمایشی کوژرانەکەی ئیمام حوسێن کرا، ئاڵای عێراق بە ڕاسەری ئەو سەرلەشکرەوە بوو کە نمایشی کوشتنی حوسێنی دەکرد. ئەوە سەرنجی حوصەری ڕاکێشابوو کە نەفرەتی خەڵک و ژنانیش بەتایبەتی ئاڕاستەی سەرلەشکر دەکرا و ئەوەش مانای ئەوەبوو: ئاڵای عێراق بەلای ئەو سەرکردە نەفرەتییەوە بووە لە کاتێکدا دەبووایە بەدەم حوسێنەوە بچووایە.

حوصەری خەریک بوو بیری لە کێشە و گرفتەکانی ئەم کارەساتە دەکردەوە، بۆیە هێمای بۆ یەکێک لە چواردەورەکەی کرد بێدەنگ بچنە خوارێ و ئاڵاکە لەو شوێنە بێزراوەوە بخەنە شوێنێکی دڵپەسەند. ئەویش دابەزی و داوای لە ئاڵابەدەست کرد ئاڵاکە بەرێتە نزیک

نوێنەرەکانی حوسێن، کەچی نوێنەرەکەی حوسێن زۆر بەتوندی بەری لێ گرت و هەتا ئەم هەوڵی لێ نزیکبوونەوەی دەدا، ئەو زیاتر دووری دەخستەوە و نیشانەکانی تورەیی زۆر پێوە دەرکەوتبوو. ئەوەبوو نێردراوەکە گەڕایەوە لای حوصەری و پێی وت چیبکەین؟

حوصەریش پێی وت: (باشترین چارەسەر ئەوەیە ئالابەدەست بێدەنگ و بەبێ ئەوەی کەس هەستی پێ بکات، لە مەیدانەکە بکشێتەوە...) ئەویش دابەزییەوە و پێی وت بکشێتەوە و ئەویش کشایەوە بەبێ ئەوەی بزانێ بۆ؟؟

## هیوابڕان

مەلیک فەیسەڵ هەوڵ و کۆششی فرە و فراوانی بۆ بەدەستهێنانی هەست و سۆزی خەڵک کرد و لەو کارەشیدا لە سەرەتاوە باش باش سەرکەوتنی بەدەست هێنا؛ بەڵام سەرکەوتنەکەی زۆری نەخایاند و هۆکاری دەروونی و کۆمەڵایەتی هەبوون وایان لە خەڵکر کرد نەرم نەرمێ لێی بتەکنەوە.

خەڵکەکە نەیاندەزانی کە مەلیکیش گیری لەنێوان داخوازییەکانی ئینگلیز و داخوازییەکانی خەڵکدا خواردووە.

ئەو هەموو هەوڵێکی خۆی دەدا بۆ یەکخستنی ئەو داخوازییە پێچەوانانە، بەڵام خەڵکەکە لەوە تێنەدەگەیشتن؛ ئەوان دەیانویست مەلیک بەتەواوەتی بەلای ئەماندا بیشکێنێتەوە و ئەو داوایەشیان بۆیە بوو، چونکە دەیانگوت هیچ گومانێکی تێدا نییە کە ئێمە ئەومان هێناوەتە عێراق و یارمەتییان داوە تا هەڵبژێردرێت و دواتریش هەڵیانبژاردووە.

ئەوسا هاوکێشەیەکی بیرکاری مێشکی خەڵکی گرتبوو. ئەو هاوکێشەیەش بە درێژایی سەردەمی پاشایەتی مایەوە. ئەویش: هەرکەس هاودەستیی لگەڵ ئینگلیز بکات ناپاکە و هەرکەسیش دژایەتییان بکات، پاڵەوانە. ئیدی ئەم هاوکێشەیە بە شێوەیەک سەر و کەللەی خەڵکەکەی گرتبوو، نەیاندەتوانی هێڵێکی ناوەندی لەنێوان ناپاک و نیشتمانپەروەر لە جیهانی سیاسەتدا دانێن.

بەڵام فەیسەڵ و دەستە و دایرە پشتیوانەکەی بە شێوەیەکی دیکە لە سیاسەت دەگەیشتن. ئەوان وەهای لێ تێگەیشتبوون کە بریتییە لە هونەری بەدیهێنانی شتە لوواوەکان (فن تحقیق الممکن). ئینگلیز بە هێزی سەربازی بەسەر نیشتمانەکەدا سەرکەوتبوون لە کاتێکدا فەیسەڵ و یارانی هێزێکی وایان نییە بە گژ ئینگلیزدا بچن. هەر بۆیە فەیسەڵ لە پرۆسەی سیاسەتکردنەکەیدا مەلاعەزەی هەردوو لای دەکرد و دەیویست پارسەنگیان بکاتەوە. ئەم جۆرە سیاسەتەش زۆر سەختە و پێویستی بە زیرەکی و لێهاتووییەکی باشە. فەیسەڵی بەستەزمان زۆری بەدەست ئەم بابەتەوە چەشت و هەر ئەوەش یەکێک بوو لە هۆی جوانەمەرگبوونی.

بەندە خۆم لە قاوەخانەکاندا گوێم لە خەڵکی بوو باسی بێهیوایی خۆیانیان دەکرد لە فەیسەڵ. ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە، لەم دوا دواییانەدا چاوم بە هەندێک بەڵگەنامەی بەریتانی کەوت کە ئەوانیش باسی بێهیوابوونی خۆیانیان لە فەیسەڵ کردووە. دیارە ئینگلیز ویستوویانە فەیسەڵیش وەک سەرباقی مەلیکەکانی دیکە هاوملیان بێت، کەچی وا دەرنەچوو.

ئەو خەڵکە لەو تەنگانەیە تێنەدەیشتن کە بەرۆکی فەیسەڵی گرتبوو. بۆیە هەموان ببوونە شرۆڤەکاری سیاسیی عەیارە بیست و چوار و خاوەنی ڕای پەسەند کە ئەگەر بێتوو مەلیک بەگوێی بکات، ئیدی زەحمەت دەبێتە ڕەحمەت و لە سیاسەتدا سەرکەوتوو دەبێت. کار

گەیشـــتبوویە ئەوەی لە بازاڕ لای پیشـــەوەرێک لەبەر شـــتێک بوەســـتایتایە، خێرا یان یەکێتان یان هەردووکتان دەبوونە ڕەخنەگری سیاسی کە ئێوە لە فەیسەڵ و هاوئاوازانی فەیسەڵ لە دنیا و سیاسەت باشتر دەزانن.

## گەشەسەندنی زیادەڕۆیانە

دەشێ بوترێت لە سەردەمی عوسمانییدا ڕای سیاسیی گشتی زۆر لاواز، بگرە هەر نەبوو، کەچی لە دەورانی فەیسەڵییدا گەشـەیەکی زۆر زیادەڕۆیانەی کرد.

خەڵکی لە دەورانی عوســـمانییەکاندا بەو چاوەوە تەماشـــای سیاسەتیان دەکرد وەک ئەوەی شتانێکن هیچ پەیوەندی بەمانەوە نییە، یان بۆیان نییە خۆیانی تێ وەردەن. بە گوزارشـــتی خۆیان (نانی تێدا نییە).

شتێکیشی بۆ زیاد بکەم کە ئەگەر دەمیان لە شتی لەو شێوانە وەر بدایە، خۆیان لە ژوورەوە دەبینییەوە، یان پێگەیان لەدەســـت دەدا یان زیانی ماددییان دەکرد. خۆ ئەگەر یەکێکیان زاتی هەبووایە لە سیاسەت بدوێ، ئەوە پێیان دەوت: (ئەم چیرۆکە هیچ دادێکمان نادات، شـتێکمان بۆ بگێڕەوە کە نانی تێدا بێت).

لە سەردەمی عوسمانییەکاندا دوو دەستەواژە زۆر زۆر باو بوون: (بە من چی؟) و (من هەقم چییە؟). مەبەســـتیشـــیان ئەوە بوو: هیچ پەیوەندییەکیان بە سیاسەتەوە نییە و ئەوە کاری ئەوان نییە. کەچی لە ســـەردەمی فەیســـەڵییدا بەکارهێنانی ئەم دوو دەســـتەواژەیە دایان لە کزی و هەمووان ببوونە ڕەخنەگری سیاسیی عەیارە بیست و چوار- وەک پێشتر باسمان کرد.

لێرەدا نابێت ئەوەش لەبیرکەین: ئەو گەشەسەندنە زیادەڕۆیە لە ڕای سیاسیی گشتیدا، لایەنی خراپی هەیە لەچاو ئەو ڕا سیاسییە گشتییەی لایەنی باشەی هەیە؛ جیاوازیشە لەو ڕا گشتییەی لە وڵاتە دیموکراتییە پێشکەوتووەکاندا هەیە.

ڕای گشتی لەوێ تەمەنێکی کردووە و خەڵکی هەر لە منداڵییەوە لەگەڵی گۆش بوون. ئەوان لەوێ وەک هەر بابەتێکی دیکەی ئەم دنیایە دەم لە سیاسەت دەکوتن بەبێ ئەوەی ترسی دەوڵەتیان هەبێت؛ بەڵام لە عێراق دەم لە سیاسەت ناکوتن مەگەر ئەو کاتەی لە خەتەر دوور بن. هەر کە دەوڵەت شمشێری خستە سەر گەردەنیان، خێرا دەچنەوە سەر قەوانە کۆنەکە و دەست بە وتنی مارشی (بە من چی؟) و (من هەقم چییە؟) دەکەن.

لە تەمەنی منداڵی مێردمناڵییمدا زیاد لە جارێک تێبینی ئەوەم کردووە کە دەمبینی تاوێک خەڵکی دەماری سیاسەتیان هەڵدەستا و تاوی دواتر دادەمردەوە. یەکێک لە نوسەرەکان هاتبوو ئەوانی بە ئاگری پلوپووش چواندبوو کە زوو بەرز دەبێتەوە و زووش دادەمرکێتەوە.

# ٦

# لە نێوان دوو نەیاردا

## ناکۆکیی هەردوو زانا (خالیصی و صەدر) لەسەر دەرکەوتنی مانگی ڕەمەزان

خالیصی فەتوای لەسەر بەشدرای نەکردنی هەلبژاردنەکان دەرکرد و بانگەوازی بۆ لەکار لادانی فەیسەڵ کرد، دواتر شاربەدەر کرا و لە ئێران سەری نایەوە.

لە پاشـــی جەنگی یەکەمی جیهانی، لە کازمییە دوو زانای ئاینی هەبوون کە بەربەرەکانێی یەکتریان لە وەدەســـتهێنانی پێگەدا دەکرد، ئەوانیش سـەیید حەسـەن صـەدر و شـێخ مەهدی خالیصـی بوون. مەردوومی ناوچەکەش بەسەر دوو جەمسەردا دابەش ببوون کە هەر لایەکیان یەکێک لەو دوو زانایەیان بە باشتر و لەپێشتر دەبینی.

ململانێکە بەتەواوی لە شەوی ١٦ـی حوزەیرانی ١٩١٩ـی هاوکات لەگەڵ ٢٩ـــی ڕەمەزانی ١٣٣٨ـــی کۆچی تەقییەوە، کە دەنگوباس بڵاو کرایەوە مانگ بەو دوو چاوی سەرە بینراوە. کەچی سـەیید حەسـەن صـەدر مانگی چاو پێ نەکەوتبوو، بۆیە بریاری دابوو سبەی درێژەی مـانگی ڕەمەزان بێت. ئەم دووانە چوونە سـەر مینبەری مەرقەدە پیرۆزەکان و یەکیان مزگێنی سـبەی جەژنی بەو خەڵکە دەدا و ئەوی دیکەشـیان بەڕۆژووبوونی سـبەینێ. ئیدی مقۆ مقۆ و بیگرە بەریدە کەوتە پەڕانپەری شـارەوە و هەر بەرەیەک بانگەشـەی ئەوەی دەکرد خۆی لەسەر هەقە.

کتێبەرکێی ئەم دوو زانایە زۆری درێژە نەکێشا و بارووەدۆخ وەها هەڵخولا ئەوەی ناو سەبەتەکەی شێخ حەسەن صەدریش بەکاوەخۆ بچێتە ناو سەبەتەی سەیید مەهدییەوە و، سەرەتای ئەو بابەتەش لەو ساتەوە دەستی پێ کرد کە خاتوو بێڵ، سکرتێری مەندووبی سامی، لە ١٣ی ئازاری ١٩٢٠دا سەردانی ماڵی سەیید حەسەنی کرد.

خاتوو بێڵ لە یادەوەرییەکانیدا باسی ئەو سەردانەی بۆ لای سەیید حەسەن سەدر دەکات کە هەروا سەردانێکی زۆر سادە و موجامیلانە بووە و قسەی ئاسایی دوور لە سیاسەتی تێدا کراوە. دیارە ئەو وای داناوە بەم سەردانەی، ویستوویەتی پەیوەندیی نێوان دەسەڵاتدارانی ئینگلیز و خەڵکە ڕەشۆکەکە بەهێز بکەن، بەڵام نەیزانیوە بەم سەردانەی، زیانێکی گەورەی کۆمەڵایەیی لە پێگەی سەیید حەسەن سەدر دەدات.

خەڵکەکە بەتەواوەتی هەواڵی سەردانەکەیان نەبیستبوو، دەستیان کردە قسە و زیادەگۆیی هەمەچەشن و هەمەڕەنگ؛ دەنگوباسی ئەوەش بڵاو بوویەوە گوایە سەیید حەسەن بڕێ پارەی باشی لە ئینگلیز گل داوەتەوە.

لە ساڵی ١٩٢٢ـشدا، هەمدیس ڕووداوێک ڕوویدا و ئەوەندەی دیکە سەیید حەسەنی بەرەوژێر و ڕکابەرەکەی بەرەو سەر هەڵبری. شێخ مەهدی هات و بەگشتی خۆی وەک ئۆپۆزسیۆنی دەوڵەت نیشاندا و بەتایبەتییش وەک دژی مەلیک فەیسەڵ خۆی پێناسە کرد؛ کەچی سەیید حەسەن خۆی لە مەقامی سکوت و بێلایەنییدا مەنگ کردبوویەوە.

ئەو دژایەتییە سیاسییەی ئەو سەردەمە ببوویە یەکێک لە پایەکانی نیشتمانییبوون (هەروەک لە بەشی پێشوودا دامانە بەر باس و خواس)؛ هەر ئەمەش وای کرد هێدی هێدی هەوادارانی سەیید حەسەن

لە کەمی و کزی بدەن و هی ئەولاش، واتە شـێخ مەهدی ژمارەیان تا دەهات لە زۆری خۆی توند دەکرد.

لە کلکەی سـاڵی ١٩٢٢، دەوڵەت بریاری هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی دامەزراندنی دا. لەو سەروبەندەدا شێخ مەهدی فەتوای هەڵپەساردن و بەشـداری نەکردنی هەڵبژاردنەکانی دا و، بە دەسـت خسـتنە دەسـتی ئینگلیزە کـافرەکـانی هەژمـار کرد. ئەوسـا بڕێـک لە دەسـتە و شـوێنکەوتووەکانی، سـپێدە زوو چوونە بەردەم سـەحنی پیرۆز تا فەتواکانی ئەو لەمەڕ حەرامێتیی بەشـداریکردنی هەڵبژاردنەکان بە دیوارەکانیدا هەڵبواسن کە بریتییە لە یارمەتیدانی کافران.

شـێخ مەهدی هەر بەوەندە کۆڵی نەدا، بەڵکوو لەناو مەردوومدا جـاڕی ئەوەی دا کە دەبێت فەیسـەڵ لە گەرۆتمـانەکەی[6] داگیرێتە خوارێ بەو تۆمەتەی دەستی بە دەستی ئینگلیزەوەیە. جارێکیشیان لە بەردەم ئاپۆڕەی خەڵکەکەدا لەپێش دەرسـخانەیەکی ئایینی وتی: ئێمە بە چەند مەرجێک بەیعەتمان بە فەیسەڵ دا تا ببێتە شای عێراق، کەچی ئەو ئەو شـەرت و مەرجانەی نەبردە سـەر، سـا ئێتر هیچ بەڵێنێک لە ئەستۆی ئێمە و گەلی عێراقدا نەماوە.

ڕاسـتت دەوێت، منیش کەوتبوومە نێوان دووڕیانێکەوە؛ باوکم و کەمینەیەک لایان بەلای سـەیید نەسـردا دابوویەوە لەکاتێکدا خزمان و دەر و دراوسـێ و زۆرینەی دانیشـتوانی شـار تەکیان بەلای شـێخ مەهدی خالیسییەوە دابوو.

قسـەگەلێکم لە باوکم دەبیسـت، تەواو پێچەوانەی قسـە و باسـی خەڵکـان بوو. هەر ئەوەش دوودڵی و نەکەوتنمی بەلایەکدا دژوارتر کردبوو.

---

[6] - گەرۆتمان: تەخت، عەرش. ئەمە وشەیەکی کۆن کۆنی کوردییە.

## دوورخرانەوەی شێخی خالیصی

تەنگەی عەسری ڕۆژی ٢١ـــی حوزەیرانی ١٩٢٣، تازەجەوانێک لە خێڵی خالیصی بەناوی شێخ عەلی تەقی هاتە سەحنە و ویستی یەکێک لە بڵاوکراوەکان بە دیوارەکەیەوە بلکێنێت، کەچی دووان لە پێپەتییە دەرۆزەکەرەکان لە دەروازەی ســـەحنەکەدا بوون و پۆلیســـی نهێنی بوون، هەســـتانەوە تا قۆڵبەســـتی بکەن و لەم کارەشـــدا پۆلیســـێکی ئاشکرا یارمەتیی دان و بەرەو بنکەی پۆلیس دایانە بەر.

پاش قەیرێک، یەکێک لە کوڕەکانی شـــێخ مەهدی بەناوی شـــێخ حەسـەن هات و ویستی بڵاوکراوەی دیکە بە دیوارەکەوە هەڵواسێت، کەچی پۆلیســـی دەروازەکە پەلاماری دایە بەو هیوایەی قۆڵبەســـتی بکات، بەڵام شـــێخ حەســـەن هاواری کرد و بە خەڵکەکەی وت: (ئەو کابرایە بکوژن، ئەوە یەهودییەکی کافرە). خەڵکیش بەربوونە نێزەی و تەختی زەوییەکەیان کرد و شـــێخ حەســـەنیش چەقۆیەکی لە باخەڵی دەرێنا و بە پۆلیسەکەی وت: (دەتکوژم)، بەڵام پۆلیسەکە توانی هەڵێت و بە پێ خاوسی و ڕەنگی هەڵبزڕکاوەوە خۆی گەیاندە بنکەی پۆلیس و شـکاتی حاڵی خۆی لای سـەرۆکەکەی (عبدالرزاق الفضـلی) کرد کە چییان وەسەر هێناوە.

عەبدولڕەزاقیش بە برێ پۆلیس و عەســـکەرەوە خۆی گەیـاندە سـەحنە، کەچی کەسـی وەچنگ نەکەوت. دواتر چوویە ماڵەکەی شـێخ حەســـەن بەو هیوایەی لەوێ بیـدۆزێتەوە؛ ئەوەبوو دۆزییەوە و دەستبەسـەری کرد؛ هەروەک چۆن شێخ عەلی برای و شێخ سـەلمان قوتەیفیشیان دەستگیر کرد کە سکرتێری شێخ مەهدی بوو.

دەوڵەت لە هەمبەر شـــێخ خالیصـــیدا ئارامی لەبەر براببوو؛ پەتی سـەبر و تاقەتی بچڕابوو؛ هەر بۆیەکانێ تەمایان گرتبوو لە وڵات وەدەریان نێن.

لە ٢٥ـــی حوزەیرانی هەمان ساڵدا، دەوڵەت بەیاننامەیەکی توندی بڵاو کردەوە و تێیدا بەخەسـتی زانایانی ئاینیی تۆمەتبار کرد کە خەریکی هەندێک کار و بارن هیچ پەیوەندییەکی بە بابەتی عەرەبایەتییەوە نییە و خەریکن قسـەگەلێک دادەتاشـن کە فڕی بە شـەریعەت و ئایینەوە نییە و مەبەسـتیشـیان پێی هیچ نییە جگە لە تێکدانی کاروباری هەڵبژاردن و گومڕاکردنی ڕای گشتی و بەربەست خسـتنە بەردەم گەیشـتنی گەل بە دەسـەڵات؛ هەروەها بەیاننامەکە دەیوت: "ئەو سـەبر و دانبەخۆداگرتنەی دەوڵەت دەرهەق ئەو هەوسـبازانە وای کردووە تەواو سـنوورەکان ببەزێنن و تەنانەت دەسـتیان بگاتە حەرەمی حەرامی مەزارگە پیرۆزەکان و لەوێ کۆمەڵێک هەڵسوکەوت بکەن کە پێچەوانەی نەریتە دینییەکانە و ئەهلی تەقوا و دین حاشـایان لێ بکەن بەوەی هاتوون بە دیواری مەزاری ئیمامەکانەوە شت هەڵبواسـن و قسـەی پووچ لە سـایە و سـێوەری ئاییندا فێنک بکەنەوە کە هەموویان زیان بە گەل دەگەیەنن.

لە کۆتاییەکەشـیدا دەڵێت: بەم بۆنەیەوە، دەبێ باش باش بزانرێت دەوڵەت لەم بابەت و کارانەدا دەست شل ناکات و سزای هەر کەسێک دەدات کە ببێتە کێشە لەبەردەم مافی ڕەوای گەلدا).

لە ئێوارەوەختەی ٢٦ـــی حوزەیران، عەبدوڕڕەزاق فەزلی بە هاوڕێیەتی موختاری گەڕەک و سـەرتیپێک و پێنج پۆلیس بێدەنگ و بێسەنگ هاتەماڵەکەی شێخ خالصی شێخیان پێچایەوە و بە ماشێنێک گەیاندیانە لای وێستگەی شەمەندەفەری بەغدا. ئەو ماشێنە، ماشێنێکی دیکەی پڕ لە سەربازی بەدواوە بوو بۆ چاودێری کردن و پاسەوانێتیی دۆخەکە.

دەمێ ئەمان گەیشـتنە وێسـتگەی شـەمەندەفەری بەغدا، دنیا لە تاریکییەکی ئەنگوسـتەچاودا نوقم ببوو؛ وێسـتگە بە پۆلیس تەنرابوو؛ شەمەندەفەرێکی تایبەتیان بۆ ساز و تەیار کرابوو کە لە سێ فارغۆن -یەکیان تایبەت بۆ شـێخ و دوانەکەی دیکەیان ئاسـایی بۆ سەربازەکان- پێک هێنرابوو.

دەمێ شـێخی خاڵسـی سـواری فارغۆنەکە بوو، سـێ گیراوەکەی دیکەش کە پێک هاتبوون لە شێخ حەسەن وەعی و شێخ عەلی تەقی و شێخ سەلمان قوتەیفی، هێنانیانە کن شێخی خاڵصی. شەمەندەفەر هەر لەسـەرخۆ و نەرم نەرمێ گەیاندنیە بەسـرە و لەوێشـەوە ئاودیوی حیجاز کران.

لە سـپێدەی ڕۆژی دواتردا کـاتێک هەواڵ بە کوچە و کۆڵانی کـازمییەدا بڵاو بوویەوە، مەردوومەکە وەک شـارەمێرووولەی ئاو تێچوویان لێ هات و دووکانەکانیان پێچایەوە و لە سەحنە بە تووڕەیی و غەزەبەوە کۆ بوونەوە؛ بەڵام عەبدوڕڕەزاق توانی بە ماوەیەکی کەم و کورت کۆنترۆڵی ناوچەکە بکات.

پۆلیسـی نـاردە بازاڕ تا ناو و ژمارەی ئەو دووکانانە بنوسـێت داخراون و دواتر سزای سەختیان بەخەڵات بداتەوە؛ لەم سەروبەندەدا و بەم بۆنەیەوە خەڵکەکە هاتنەوە سـەر دینە کۆنەکەیان و خێرا و شـەپەشـەپ دەسـتیان کردەوە بە کردنەوەی دووکانەکانیان و بەلای چەپ و ڕاسـتدا ئاوڕیان دەدایەوە نەبادا یەکێ بیانبینێت و بە زمانی حاڵیان دەیانگوت: (بە من چی؟)، (من هەقم چییە؟)

دەوڵەت پەیامێکیشـی ئاڕاسـتەی گەل کرد کە ئەمە دەقەکەیەتی: (بەشـی پێویسـت بەڵگەی سـەلمێنەر هەن کە شـێخ مەهدی و دوو کوڕەکەی و شـێخ عەلی تەقی و شـێخ سـەلمان قوتەیفی بوونە هۆی دەرکردنی بەیاننامەی پێشـووتر و بەو هۆیەشـەوە شـاربەدەر کران. بۆیە دەوڵەت پێی خۆشـە جارێکی دیکەش ڕوونی بکـاتەوە کە

مەبەستێتی دەسەڵاتی یاسایی ڕادەستی نوێنەرانی ڕاستەقینەی گەل بکات و ناشتوانێت دەستی لەهەمبەر یاری و گەمەی بێگانانداندا لەژێر پەردەی دەسەڵاتی دینیدا لەو بابەتانەدا شل بکات کە پەیوەندییان بە مافی گەلەوە هەیە.)

## وەفاتی خاڵیسی

پاش ئەوەی خاڵیسی فەریزەی حەجی ماڵی خودای وەجێ هێنا، ملی ڕێی ئێرای گرتەبەر و سەرەنجام لە مەڵبەندی خۆراسان گیرسایەوە. سکرتێرەکەشی لێی تەکییەوە و گەڕایەوە بۆ ئێراق و بەناوی سەلمان صەفوانییەوە دەستی بە کاری ڕۆژنامەوانی کرد.

لە تەنگەی ئێوارەی ٧ی نیسانی ١٩٢٥دا، بروسکەیەک لە خۆراسانەوە خۆی بە کازمییەدا کرد کە هاڵی وەفاتی خاڵیصی لەخۆیدا هەڵگرتبوو. شار و بازێڕ بەو هەواڵە خرۆشان، مەردووم دایانە پرمەی گریان. بۆ سبەینێی ئەو ڕۆژە، هەرچی دووکان و بازاڕ هەیە داخران و خەڵکەکە دەستیان بە سینەزەنی و خۆڕنین کرد، هەر بەو شێوەیەی بۆ حسێن دەیکەن. دەوڵەتیش لەهەمبەر ئەم کارەدا خۆی کڕ و بێدەنگ کرد و ئەوەش وای کرد ڕۆژ بەڕۆژ شین و ڕۆژ لە ڕۆژ پەرەی زیاتر بسێنێت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە، مەردوومی ئەعزەمییە -کە شارۆچکەیەکە لە بەری دیجلەوە دەکەوێتە باشووری کازمییە- وەفد و شاندی تایبەتیان ناردبوویە لای تەعزیبارانی کازمییە تا لەگەڵیان خەمەکە بەش بکەن و بشیکەنە بەڵگەی ئەوەی ئەوەی لەدەست چووە، لە دەستی گشت موسوڵمانان چووە نەک تەنها تایفەی شیعە و هەڵبەستەکەشیان کە لەبەر خۆوە دەیانوتەوە ئەمەبوو:

يا عمود الإسلام حامى الشريعة

يتمت ها المخلوق سنة وشيعة

ئەمەش هاوشـــێوەی ئەو ڕووداوەی ســـێ ســـاڵ لەوەبەر بوو کە خەڵکی ئەعزەمییە لە ڕوداوی شـــۆڕشـــی بیســـتەمدا کردیان کاتێک شـاندیان نارده لای ســەحنەی کازمییە بەبۆنەی ڕۆژی عاشـووراوە و بەم شێوەیەش هۆنراوەکەیان دەگووتەوە:

جيت أشدكم يا شيعة صدق زينب سلبوها

أی وحق جدها وأبوها حتى الخيام حرقوها

پرســـە لە کازمییە و بەغدا و زۆرێک لە شـــارەکانی دیکە گێردرا و شاعیر و وێژەوان و وتارخوێنی شیعە و سوننە بەشدارییان تێدا کرد کە لە نێوان بەشـــداربووەکاندا جەمیل ســـدقی زەهاوی و مەعرۆف ڕەصـــصـــافی و حاجی نوعمان ئەعزەمی و عەبدولحســـێن ئەرزی و عەبود کەرخی هەبوون.

پرســـەی کازمییە لە دەرســـخانەکەی خالیصـــی خۆی لە کازمییە دەگێڕدرا. منیش لەوێ ئامادەییم هەبوو تا گوێم لە وتار و پەخشانەکان بێت و هەڵنانی گوێگرەکانیش ببیســـتم کە دەیانگوت: (أحســـنت! دەمخۆش! دووبارە!)

لە گرنگترین ئەو پەخشـــانـانەی لەنـاو ئەو کۆڕی تەعزێیـانەدا خوێنران، پەخشـــانەکەی شـــاعیری خۆجێیی، مەعروف عەببود کەرخی بوو. ئەو قەســـیدەیەی چاپ کرا و لە بازاڕدا فرەیەکی لێ فرۆشـــرا. ئەوەی لێی بیرم ماوە، ئەو جووتخشـتەیەیە کە لەسـەر زاری خەڵکیش دەماوەدەمی پێ دەکرێت:

غاندی بالهند زغلول بمصر

وإنت ثالثهم الی هذا القطر

مانای ئەو جووتخشتەکییەش ئەوەیە: خالیصی سەرگەلی عێراقە هەروەک چۆن غاندی لە هیند و زەغلولیش لە میسر سەرگەلن.

سەیری خۆش ئەوەیە مێژوونووسی دیار، دکتۆر جەواد عەلی ئەو ڕۆژانە تەلەبە بووە لە دەرسخانەی ئیمام ئەعزەم لە ئەعزەمییە. ئەوجا تەربوشێکی وەک ئەفەندییەکان لەسەر نابوو و خۆی بە پرسەخوانییەکەدا کرد و ئەویش پشکی خۆی پەخشانێکی خوێندەوە و بە شان و باڵی خاڵیصییدا هەڵی وت و لەلایەن ئامادەبووانیشەوە ستایش و ئافەرمێکی فرە و فراوان کرا. لەناو هۆنراوەکەشیدا دوو دێری تێدا بوو تەحەددای عەببود کەرخی دەکرد و دەیوت:

إن فاخرت مصر بسعد زعيمها

سعد يقاس بآية الجبار؟

ئەگەر تۆ شانازیی میسرت بەستووەتەوە بە سەعد زەغلولەوە؟

چما سەعد چۆن بەئایەتی خودا بەراورد دەکرێت؟

مانای ئەم بەیتە ئەوەیە ناکرێت خالیصی و سەعد زەغلول بەراورد لە کاتێکدا خاڵیصی ئایەتی خودایە.

لە دەمی بیستنی ئەم بەیتەدا، خەڵکەکە هاواریان لێ بەرز بوویەوە و أحسنت أحسنت و ئافەرم ئافەرمیان دەگوتەوە.

ئەو هۆنراوەیەی مەعروف ڕەصافی خوێندییەوە، ئەویش ستایش و ئافەرینی خۆی وەک ئەوانەی کەرخی و جەواد عەلی وەرگرت.

لەناویدا دوو جووتخشـــتەکی هەبوون کە بۆ ماوەیەکی نەکەم خەڵکی پێی سەرسام بوون و لەبەر خۆوە دەیانگوتەوە:

رحم الله شيخنا إنه كان

بعيدا عما تريد السياسة

ما تعاگی غیر الخداع غلادستون

كلا ولا دلكاسة

ئەو دوو ناوە (گلادسـۆن و دلکاسـە) کە ڕەصـصـافی هێناونی، لە بەناوبانگترینی سیاسـەتمەدارانی کۆتایی سـەدەی نۆزدەهەم بوون کە یەکەمیان بەریتانی و دووهەمیشیان فەڕەنسییە. مەبەستی شاعیریش ئەوەیە: شـێخی خاڵصـی دوورە لە فرت و فێڵ و درۆی سـیاسـەت کە کەسانی وەک گلادستۆن و دلکاسە خەریکینی.

## ئاماژەیەکی کۆمەڵایەتی

شێخی خاڵصـی لەپاش مەرگی، لە گشت جێیەک بوویە ئەفسانەی سـەرزاران. ئەوەش ئاماژەی بۆ سـروشـتیی باوی ئەوسـای خەڵکی عێراق دەکرد. ئیدی ئەوە قەدەری هەر کەسـێک بوو کە ببێتە نەیاری دەوڵەت و شۆڕشی بەسەردا بکات (وەک لە بەشی ڕابردوودا بەرباس خرا).

هەر لەو سەروبەندەی شان و شکۆی خاڵصی هەڵدەکشا، شان و شـکۆی ڕکابەرەکەی (سـەیید صـدر) ڕووی لە لێژایی بوو. تەنانەت

کاروبار بە شــوێنێک گەیشــتبوو، کاتێک ســەید صــەدر لە کوچە و کۆڵانەکانی کازمییەدا بەلای خەڵکیدا ڕادەگوزەری، بە چاوی غەمز و لەمز و سوکایەتییەوە سیلەیان دەدایە.

ســـەیید حەســـەن ئەو کاتە پیاوێکی بەســـاڵاچوو بوو؛ ڕاهاتبوو بەســـواری گوێدرێژ دەچوویە نوێژی جەماعەت. منیش جاروبار دەمبینی خاوەن‌دووکانەکان قســـەی ناخۆشـــیان بەتەنکەیەوە دەنا و ئەویش ئارامی لەسەر دەگرتن و بێدەنگ دەبوو.

ئەوەی زیاتر قوڕەکەی خەســـت دەکردەوە ئەوەبوو: ســـەیید موحەممەدی کوری ببوویە جێمتمـانەی مەلیـک فەیصـــەل و پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ چاک کردبوو؛ مەلیکیش کردبوویە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران. ئێ مەردوومیش ئەمەیان بە ناپاکییەک هەم لە خۆی و هەمیش لە باوکییەوە دەبینی.

سەیید موحەممەد لە گەڕەکی (البجیة) دادەنیشت کە یەکێک بوو لە کۆنترین گەڕەکەکانی کازمییە. بۆیە ئەو دەمانەی دەیویســـت بگاتە وێســـتگەی ترامواى کە دەکەوتە ناوچەی کەرخ تا بگاتە ئەنجوومەنی نوێنەران، دەبوو بە هەندێک بازاڕ و قەیســـەرییدا تێپەڕێت. ئەوەی من لەم بارەیەوە بیرم دێت ئەوەبوو: ڕۆژنامەفرۆشـــم دەبینی دەکەوتنە شـوێنی هاواریان دەکرد: (هەواڵی سـیخووڕی هەرە زل) کە بێگوومان مەبەستیان سەیید موحەممەد صەدر خۆی بوو!

ســـەرەنجام ســـەیید موحەممەد صـــەدر ناچار بوو ماڵەکەی ئەوێی چۆڵ بکات و یەکێکی دیکە لە ناوچەی (الجعیفر) کە دەکەوتە نزیک شوێنی دانیشتنەکەی لە پەرلەمان بە کرێ بگرێت.

## ٧

# لەنێو (مەکتەبلی کوڕی ئەفەندی)دا کەسایەتییم دروست بوو

**سەیر و سەمەرەی دنیا لەوەدایە لەو ڕۆژەی من بوومە عەنتار، هەر لەو ڕۆژەدا قەیرانی دارایی جیهانی سەری هەڵدا؟!**

**خانەوادەکەم ئاهەنگێکیان بەبۆنەی خەتم کردنی قورئانەوە بۆ گێڕام!**

لە بەشەکانی پێشوودا باسی هەندێک ڕووداو و پێشهاتی سەردەمی منداڵی و مێرمنداڵیی خۆمم کرد کە کاریگەرییان لەسەر کەسایەتییم هەبووە؛ سا لەم بەشەدا باسی هەندێکی دیکەیان دەکەم کە کاریگەریی ڕاستەوخۆ و زۆرتریان لەچاو ئەو ڕووداوە گشتییانەدا هەبووە.

لە بازاڕی کازمییە، هەندێک پەڕاوی فێربوونی خوێندنەوە و نوسین و ژماردن هەبوو. هەروەها لە شارۆچکەکەدا تەنیا یەک خوێندنگەی هاوچەرخ هەبوو کە ئەویش لە دوادواییەکانی دەورانی دەوڵەتی عوسمانییدا بنیات نرابوو و دەکەوتە بەشی باشوور لە نزیک کۆشکی دەوڵەت و خەڵکیش ناویان لێنابوو (مەکتەب). هەروەک چۆن بە تەلەبەکانیشیان دەگوت (مەکتەبلی).

زۆرێک لە خەڵکی بە چاوی شک و دردۆنگییەوە تەماشای مەکتەبەکەیان دەکرد. ئەم شک و ناڕەزاییەش هەر لە دەورانی عوسمانییەوە بە میرات بۆ خەڵکەکە مابوویەوە چونکە تەنها

ئەفەندیزادەکان، پیاوانی دەوڵەت دەیانتوانی ڕۆڵەکانیانی تێ بنێرن و، بە شـوێنێکیشـیان دادەنا کە لادانی سـێکسـی لە منداڵەکاندا بەرهەم دێنێت. هەر لێرەکانێوە ئەو پەندە باوە سەری هەڵدا کە دەڵێ: (کتێبەکان فڕێ دە، مەکتەب هیچ دەردێ دەرمان ناکا).

ئامانجی مەلیک فەیسـەڵ برەودان بوو بەم مەکتەبانە و دنەدانی خەڵک بوو تا منداڵەکانیانی تێ بنێرن. بەڵام کەمینەیەک نەبێت، کەس بەدەنگ ئەم بانگەوازەوە نەهات و زۆرینەی مەردوومەکە لەسەر ئایینە کۆنەکەی خۆیان مانەوە.

باوکیشـم وەک ئەو گشـتە خەڵکە لەسـەرەتاوە هەر بەو چاوەوە تەماشـای ئەو مەکتەبانەی دەکرد، هەر بۆیە دامیە بەر خوێندنی دەرسـخانە و حوجرە و منیش لەسـەر شـێوە و نەریتە باوەکە لای مامۆسـتا شـێخ سـەعید کە لە مزگەوتەکەی نزیک ماڵی خۆمان بوو، فێرە نوسـین و خوێندنەوە و ژمارە بووم. پاش قەیرێک کە نازانم چەندی درێژە کێشـا، قورئانم لەمسـەر بۆ ئەوسـەر خەتم کرد. ئیدی ئاهەنگێکیان بۆ گێڕام و هەندێک لە تەلەبەکان بە مۆمەوە لە دەمی دەرسخانەوە بە سروود گەیاندمیانەوە ماڵێ.

ڕۆژێکیان باوکم لە دەرسـخانەی دەرکێشـام و لە مەکتەب لە پۆلی دوو ناوی نوسـیم، کەچی ئەوەندەی نەخایاند پەلکێشـی کردمەوە دەرسـخانەکەی شـێخ سـەعید و قسـەیەکی کرد کە وەک هەڵقە بە گوێمەوە هەر ماوەتەوە: (مەکتەب دەرد ناخوات!)

ئەم جارەیان لە دەرسـخانە نزیکەی چوار سـاڵان مامەوە تا گەیشـتمە پۆلی پێنج. لە وانەکانیشـمدا باش و تەوان بووم و گشـت سـاڵێک یەکەمی سـەر پۆلەکەم دەبووم، کەچی ئەمەش هەر ئاوی دڵی باوکمی نەدا و لەوێشـی دەرکێشـام و برمیە بازاڕ تا خودا بکا و فێری پیشـەیەک بم بەهۆیەوە لە گەورەییمدا نان پەیدا بکەم. دیار بوو ئەو

وایدەزانی خوێندن لە داهاتوودا دەستەبەری قووت و بژێوی بنیادەم ناکات.

## لە دووکانەکەی باوکمدا

ماوەیەکی نە چەندان درێژ لە دووکانەکەی باوکم مامەوە. ئەوەش یەکەم ئەزموونی نێو بازاڕ و کڕین و فرۆش بوو بۆم. پاشـــی ئەمە چەند ئەزموونێکی دیکەش هاتنە بەری. ئێســـتا هەســـت دەکەم ئەو ئەزموونانە ســوودی باشـیان پێگەیاندووم لەوەی پتر لە سـروشـتی بنیادەم تێبگەم.

جێگەی داخە باوکم لە هونەری مامەڵە لەگەڵ کڕیارەکاندا لێزان نەبوو؛ ئەوەش هونەرێکی ژیانییە بۆ هەر کەســێک کە لە بازاڕدا هەڵخول و داخولی بێت و بەتایبەتییش بۆ جەواهیرفرۆشـــان. باوکم خێرا هەڵدەچوو؛ کە ڕایەکیشـــی دەردەبڕی، ئیدی بە هەقی تەواوی دەبینی، هەر بۆیەش بە کریارەکانییدا خێرا خێرا هەڵدەشـــاخا. بۆیە نەرم نەرمێ ژمـارەی کڕیـارەکـانی لە کەمییـان دەدا. بە بۆنەی ئەوەشیەوە چ ئێمە و چ خۆشی، ماوەیەکی سەختمان تێپەڕاند.

ئەم تایبەتمەندییەی باوکم تەنها لەگەڵ کریارەکاندا نەبوو، بەڵکوو هەموو کەســێکی دەگرتەوە کە بە جۆرێک لە جۆرەکان بەرکەوتنیان لەگەڵیدا هەبووایە. خۆی بۆ خۆشـی هیچ ئیرادە و بژاردەیەکیشـی لەو کارەدا نەبوو، چونکە کەســایەتییەکەی کە بۆی دروســت ببوو، وەک کەسایەتیی هەر کەسێکی دیکە بەرهەمی ئەو کارلێکە بوو کە لە نێوان بۆماوە و ژینگەدا بۆی دروســت ببوو (هەروەک لە بەشــی پێشــودا باســمان کرد). بەڵام خەڵکی لەم شـــتەی تێنەدەگەیشـــتن. خەڵکی وا

دەزانن مرۆڤ خۆی دەتوانێت چۆنی بوێت، خۆی بەرهەم بهێنێت، هەر بۆیە لەسەر شکستەکانی ژیان لۆمەیان دەکرد.

دوکانەکەی باوکم چەشنی دەرسخانەیەک شتی زانستیی تێدا فێر بووم. فێری ئەوە بووم کە هەق لەناو خەڵکیدا بابەتێکی ڕێژەییە و لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێت؛ ئەوەی لای ئەم هەقە، لای ئەو بەتاڵە. هەر لێرەوەیە ئەو پەندە باوە لە نێوان پیشەوەرانی وڵاتانی پێشکەوتوودا بڵاو بووەتەوە (هەمیشە هەق بەلای کڕیارەوەیە).

پیشەوەر و دووکانداری سەرکەوتوو ئەوەیە کە لەسەر بنەمای هەق و بەتاڵ لەگەڵ کڕیارەکانیدا نەجووڵێتەوە وەک ئەوەی باوکم و هەوشێوەکانی باوکم دەیانکرد، بەڵکوو لەسەر بنەمای (کڕیارەکان هەمیشە لەسەر هەقن). ئەوەش دەبێتە هۆی زیانێکی کەمی نزیک مەودا و قازانجێکی زۆری درێژمەودا. هەر بۆیەش ناوبانگ دەرکردن بۆ پیشەوەر و فرۆشیار زۆر لە دەمەدەمە و هەرا و گۆڵمەز بەسوودترن بۆی.

پرسیارم لە یەکێک لە فرۆشیارەکان لەبارەی بنەمای (هەمیشە کریار لەسەر هەقە) کرد، کەچی بەم شێوەیە وەڵامی دامەوە کە ئەگەر لەسەر ئەو بنەمایە بجووڵێمەوە، ئەوا هەندێک لە کڕیارەکان دەمخۆن. بە بڕوای ئەو، لێرە کریار بۆ هەلێک دەگەڕێت تا ماڵی فرۆشیار بەتاڵان بەرێت و ڕووتی بکاتەوە؛ ئەوەش دەیخاتە سەر ساجی عەلی.

ڕای ئەو بەڕێزە لە چوارچێوەی ژینگەی خۆیدا زۆر ڕاستە چونکە لای ئەم پەیوەندییەکە لەسەر بنەمای (بەسەردا زاڵبوون) بنیات نراوە. واتە هەرکامیان دەیانەوێت بەسەر ئەوی دیکەیاندا زاڵ بن. هەر لێرەڕا ئەو پەندانە بەناو خەڵکیدا بڵاوبوونەتەوە: (هەزارجار خۆت پێت هەڵکەوێت، بەڵام یەکجار نەتخەن و نەتخەڵەتێنن) (مامەڵە و سەودا بکە تا ئارەقە دەکەیتەوە).

ڕاستەڕێی ئەم بوارە بریتییە لەوەی نە شیش بسوتێ و نە کەباب؛ واتە فرۆشیار نە زۆر ئەملا بگرێ و نە زۆر ئەولا. ئەو لە لایەکەوە نابێت لەسەر بنەمای هەق و بەتاڵ مامەڵە بکات و ناشبێت بنەما و بەند و باوە کۆمەڵایەتییەکان پشتگوێ بخات.

خۆ وەنەبێ ئەم بنەمایە تەنها سوود بە فرۆشیار بگەیەنێت، بەڵکوو بۆ هەر مرۆڤێک لە مرۆڤەکان کە دەیەوێت لەگەڵ دیگەراندا مامەڵە بکات چونکە وەک دیارە مرۆڤ لە هەرکوێیەک بێت هەر مرۆڤە و سروشتەکەی لە گشت بووارەکاندا زۆر لێک دەچێت.

## عەتتاری

لەو دەمانەی لە دووکانەکەی باوکم خەریکی کار بووم، ڕۆژێکیان بڕیاری دا لەوێ نەمێنم و بچم خۆم فێری پیشەیەکی دیکە بکەم. سەرەتا هۆی ئەو داوایەییم نەزانی و دواتر لێم ڕوون بوویەوە.

خاوەنی ئەو ڕیزە دووکانە بەڕێز سەیید جەعفەر بوو، باوکیشم چەند مانگێک بوو کرێی بۆ نەدرابوو و ئەوەش وای کردبوو بەردەوام ئەو داوای پارە کەڵەکەبووەکەی بکات و سەرەنجام باوکم لە ژوورەوە خۆی بینییەوە. چەند ڕۆژێکیش لە ژوورەوە مایەوە تا سەیید جەعفەر پیاوەتیی خۆی نواند و هێنایە دەرێ!

وا دەردەکەوێت باوکم حەزی لێ نەبووە دەمەقاڵێی خۆی و سەیید جەعفەر باس بکات، بۆیە داوای لە من کردووە بچم و خۆم بە شتێکی دیکەوە سەرگەرم بکەم.

پاشی ماوەیەکی کەم، بڕیاری دا ببمە شاگردی عەتتارێک کە بە زمانە باوەکە دەبێتە عەترفرۆش. ئەو دووکانەی کارم لێ دەکرد،

دەکەوتە گەڕەکی ئەنبارییەکان و خاوەنەکەشـــی ناوی (موحەممەد ڕەزا) بوو. مانگانەکەشـم بریتی بوو لە پێنج ڕووپییە کە دەیکردە تەنها (٣٧٥) فلس.

نزیکەی دوو دانە ســـاڵی ڕەبەق لەوێ کارم کرد. ئەو ماوەیە بە ســـەختترین ســـەردەمی ژیانم دەژمێرم کە لە خۆرهەڵاتنەوە تا یەک کـاتژمێر دوای خۆرئـاوابوون کـارم دەکرد، بەبێ دوو کـاتژمێر کە یەکێکیان تێیدا دەگەڕامەوە بۆ فراوین و ئەوی دیکەشـــیان نوێژەکانی نیوەڕۆ و عەسرم لە مزگەوتەکەی نزیک خۆمانەوە دەکرد.

ئەوسـا لە نەریتی خاوەن دوکانەکان نەبوو هەینییان بکەنە پشـوو؛ بۆیە تەنـانەت یەک ڕۆژی حەســـتانەوەم نەبوو؛ هەر حەوت ڕۆژی حەوتە لە مەینەت و دژوارییدا بووم.

لە دەمەو عەســـری یەکێک لە ڕۆژەکاندا خاوەنکارەکەم بۆ کارێک نـاردمییە کەنـار دەریـا. لەوێ بینیم پڕە لە قـاوەخـانە و خەڵکی لنگی لەســـەر لنگ ناوە و گوێ لە بەزم و گۆرانی دەگرن. ئەو گۆرانییانەش کە ئەوســـا باوی بوو، گۆرانییەکانی موحەممەد قەبانچی و ڕەشـــید قەندەرچی و بەدرییە ئەنوەر بوون. ئەو ڕووداوە سەرنجی ڕاکێشام و وای لێ کردم لە خۆم بپرســـم: (چما ئەمانە چۆن قووتیماڵیان پەیدا دەکەن؟ چمـا لەکوێ دەژین؟) چونکە من ڕاهـاتبووم دەبێـت نـان پەیداکردن ســـەخت بێت و لە خۆرهەڵاتنەوە تا کاتژمێرێک پاش خۆرئاوابوون بۆی بکۆشم!!

تەنانەت ئەو ماوە دژوارەش لەســـەر بنەمای (شـــەڕیش ســـوودی خۆی هەیە) خاڵی نەبوو لە سوود و وانە. لەو دەورانەدا فێری وانەیەک بووم کە نەمتوانیبوو لە قوتـابخـانە فێری ببم. لەو مـاوەیەدا توانیم خەڵکی بەبێ ڕتووش و پەردە بناسـم. ئەو موجامەلە و ڕێزگرتنەی کە لەناو مەردوومدا دەرهەق بە کەسـانی گەورە و پوولدار زیاترە لەچاو

کەسـانی بێدەرەتان و دەسـتکورتدا کە بارووودۆخی ژیان خلۆری کردوونەتەوە.

هەر بۆیە کەسـانی پێگەبەرز زۆر بەئەسـتەم دەتوانن خەڵکی وەک ئەوەی هەیە بناسـن؛ ئەو ڕاهاتووە بە شێوەیەکی ئاسـایی و بەردەوام هەر خۆنزیکردنەوە و خەسـتکردنەوەی ماسـتاویان لێ ببینێت و ببیسـتێت. بەڵام هەژارێکی وەک من زۆر ئاسـانە مەردوومەکە وەک ئەوەی هەن بناسێت.

هەر خۆم هەندێک خەڵکم دەبینی بە لوتی بەرز و سـوکایەتییەوە دەیاندواندم، لە کاتێکدا هەندێکیشـیان بە ئەوین و خۆشـەویسـتییەوە لەگەڵم دەدوان. منیش هۆکاری ئەو جیاوازییەم نەدەزانی. پاشـتر بەهۆی خوێندنەوەی سروشتی مرۆڤەوە تێی گەیشتم.

## قۆناغێکی دیکە

پیشـەی عەتتاری هەم بۆم نەدەشـا و هەمیش تێیدا سـەرکەوتوو نەبووم. بەوەی کە بەردەوام سەرم بەسەر کتێب و خوێندنەوەوە بوو، دیارە عەترفرۆشـیش دەبێ بەردەوام بەدەم کڕیارەکانییەوە بێ و کاری بکات کەمەنکێشی بن و بزانێت چۆنیان مامەڵە لەگەڵ دەکات.

لە پشـتەوەی دووکانەکە ڕەفەیەکم هەبوو، کـتێب و گۆڤارەکانم تێیدا سـەفتە کردبوون. لە خودام داوابوو یەک خولەک وەستاکارەکەم لەوێ نەبێت و سـەر بکەمەوە بەناو کتێب و گۆڤارەکـاندا و کڕیارەکانیش بچن و لە عەترفرۆشـییەکانی دراوسـێمان بۆخۆیان چ بۆنێکیان پێخۆشـە بیکڕن، ئەوەش وەسـتاکەمی تەنگاو کردبوو. ئەوەبوو ڕۆژێکیان ئاماژەی بۆ ڕەفەکە کرد و بە ئامۆژگارییەوە وتی: هەتاوەکینەی ئەو ڕەفەیە لەوێدا بێت، تۆ خێر بۆ من نادەیتەوە.

دواتریش خۆم هەستم کرد کە ڕاستی دەکرد و لەسەر هەق بوو. دیارە بنیادەم کە ویستی لە کارێکدا سەرکەوتوو بێت، دەبێت خوی بداتێ و سەری تێ بکات، ئەگینا وەک پەندە باوەکە دەڵێت: "دەبێتە کابرای لە دوو جەژنە بوو".

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٢٩دا، هەستم کرد خاوەکارەکەم چیدی سەبر و تاقەتی نەماوە و لە بیری ئەوەدایە چۆنم پاڵ پێوە بنێت. کاتێکیش لەماڵەوە ڕاوێژم بە باوانم کرد، سەرپشکیان کردم کە خۆم چۆنم دەوێت با وا بێت و ئەوەش یەکەمجار بوو ئاوا سەرپشک بکرێم. ئەدی دوودڵییەکی خەست سەر و گیانی داپێچام کە نەمدەزانی چیبکەم؟!

قەدەر وای خواست، ئێوارەی ئەو ڕۆژە سەیید جەعفەر ئاهەنگی هاوسەرگیریی بۆ نەوەکەی (عبدالرضا) دەگێڕا و بەختی منیش کەوتە ئەوێ و دانیشتم و گوێم لە شەرەشیعر و گۆرانیی موحەممەد قەبانچی و گۆرانیبێژێکی دیکە بەناوی سەلمان شوکرجییەوە گرت. ئیدی ئەو پێشبڕکێیە کاری بڕیاردانەکەی زۆر بۆ ئاسانتر کردم و بڕیارم پێ درا.

لەپاش ساڵانێک، ڕۆژێکیان هەڵتەقیم بە موحەممەد قەبانچیی گۆرانیبێژدا و پێم ڕاگەیاند بەبێ ئەوەی خۆی خەبەری هەبێت، چاکەیەکی بەسەر شانمەوەیە. بەکاوەخۆ حەقایەتی ئەو شەوەم لەسەرڕا تا خوار بۆ گێڕایەوە و قەیرێ بەدیار سەیر و سەمەرەیی قەدەرەوە پێکەنین.

دواتر نزیکەی چەند هەفتەیەک سەرەگێژەم گرتبوو، خۆشم نەمدەزانی ڕوو بەکوێوە نیم! لە شاگردانەی ئەو ماوەیەشم نزیکەی حەفتا ڕۆپیەم پاشەکەوت کردبوو؛ قەولم دا دووکانۆچکەیەکی عەتتاری بەو بڕە پارەیە بکەمەوە. خێرا قەولەکەم بردە سەر و لە گرتنی دووکاندا خێرا کارم بەدەستەوە هات و هەندێ ئامرازی

عەتتاری و شـــایەن (ترازوو)یەکی چکۆلەشـــم لەپەنایان دانا. کرێی مانگانەی دووکانەکە یەک ڕوپیە بوو کە دەیکردە ٧٥ فلس. ئێستاشـی بەدەمەوە بێت، ئەو دووکانە هەر ماوەوە تاو تاو سـەرێکی لێ دەدەم تا ڕۆژانی ڕابردووم جوانتر بێنەوە یاد.

ســەیری دنیـا لەوەدا بوو، قەیرانی ئـابووریی جیهـان لەو سـەروبەندەدا دەسـتی پێکرد کە من بوومە عەتتار! سـەردەمێک بوو تێیدا کۆمەڵێک وڵات بەدەسـت قەیرانی ئابوورییەوە -و عێراقیش لەناویاندا - دەســتیان بە ناڵە و نرکە کردبوو. بازار کەسـاس و کۆمەڵێکی زۆر لە بازرگانان مایەپووچیی خۆیانیان بە ڕۆژی نیوەڕۆ ئاشکرا کردبوو. بەشی منیش بە ئەندازەی بچوکییەکەی خۆم بوو.

هەرچۆنێک بێت، ئەو سـەردەمەی ژیانم لە گشـت سـەردەمەکانی دیکە جیاوازتر بوو چونکە بە کەیفی خۆم چم ویســتبا دەمخوێندەوە بەبێ ئەوەی کێ بڵێ ئەوە چی دەکەیت و چۆن دەڕۆیت. هەروەها ئازادیش بووم لەوەی کەی بمویستایە دەرابەی دووکانم دادەدایەوە و بۆ کڕینی کتێب و ڕۆژنامە دەمگوت: بەغدا خۆت بگرە هاتم!

لە بەغدا بازاڕێکی تایبەت بە کتێـــب و ڕۆژنامە بەناوی بازاڕی سـەرا هەبوو؛ بۆیەش ئەو ناوەی پێوە پێچرابوو، چونکە لە سـەرای دەوڵەتەوە نزیک بوو. بەندەش ماوە نا ماوەیەک سەرم لێ دەدا و چم دەویست دەمکڕی. خەیاڵی گەورەم ئەوەبوو، بچم و ڕۆژنامە و گۆڤارە کۆنەکان بکرم چونکێ هەرزان بوون و توێشـوویەکی هەرە باشـی فیکریم تێیاندا دەماشییەوە.

سـەرنجی زیاترم لەسـەر گۆڤارە میسـرییەکان بوو، بەتایبەتییش (الهلال) و (المقتطف). ژمارە کۆنەکانیان لە سـەرا بەردەسـت بوو، منیش باش باشم لێ دەکڕین و هێشتاش هەندێکیانم هەر ماونەتەوە.

له دووکان زۆر بەتەنگ کڕیارەکانمەوە نەبووم. بە بای خەیاڵمدا دەهات ئەگەر زیادیان بکرایە یان کەم. چەقی سەرنج و گرنگیپێدانی من بەلای خوێندنەوەوە بوو. ئەوەش وای لێکردم دەست بدەمە لاسایی کردنەوەی ئەو نوسەرانەی کە دەمخوێندنەوە و بەندەش پێنوس بخەمە سەر تێنووس. هەروا چەند بابەتێکم بۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکانی بەغدا نارد و ئەوانیش خوا هەڵناگرێ پشتگوێیان خستن مەگەر چەندۆکەیەکیان نەبێت.

ئەو وتارانەم کە لە ساڵی ١٩٣٠ بڵاو کرانەوە، ئێستا جێگەی شانازییمن چونکە ئاماژەی ئەوەن کە وا نزیکەی شەست ساڵە خەریکی نوسینم. ئەوەش ماوەیەکی کەم نییە و سەرڕێژە لە ئەزموون کە دەشێ لە بەشەکانی دیکەدا شتێک لەو ئەزموون و ناوەڕۆکە دەروونی و کۆمەڵایەتییانە بە ئەندازەی توانای خۆم بخەمە ڕوو.



# ڕووداوەکەی سەحنە

**ڕووداوەکە دەســـتی مەلیک یان ئینگلیزی تێدا نەبوو، بەڵکوو بەهۆی هەرا و گۆڵمەزەوە قەوما**

مەبەســتم لە ســەحنە ئەو مەیدانە بەرفراوانەی بەردەم مەزارگەی کازمییەیەیە لە هەر سێ لاکەیەوە. لە بەشــەکانی پێشــووشــدا زیاد لە جارێک و دووان باســـمان کرد. ئەویش بە قەڵایەکی بەرزی ئۆتاق ئۆتاق دەورە دراوە و بەرهەیوانی زۆریشی هەن.

لەم ســەحنەیەدا و لە هەموو ســاڵێک لە ڕۆژانی عاشــوورا، یادی شــەهیدکرانی ئیمام حوسـێندا قەڵەباڵغی و تەعزیێبارییەکی زۆر وەگەڕ دەخرێت هەر بەو شێوەیەی لە دێر زەمانەوە باوە. لەو ڕۆژانەدا ئۆتاق و بەرهەیوان لە ژن و مەیدانەکەش لە پیاو پڕ دەبێت.

لە ساڵی ١٩٢٧، خوا کردی و عاشوورا کەوتە ١٠ـــی تەمووز کە ئەوســا منیش تازەجوانێکی ١٤ ســاڵە بووم. هەر لە بەیانی زووەوە وێڕای باوکم هاتبووینە سەحنە و لەگەڵ سـەرباقیی مەردوومەکەدا لە شــوێنێکدا ســرەوتین. کەچی ئەو ڕۆژە بە دیمەنێکدا هەڵتەقین کە هەرگیز لەوەوبەر شــتی وامان نەدیتبوو، ئەویش ئامادەیی چەند ڕیزە سەربازێکی بێچەک لەلای قیبلەوە.

وا دەردەکەوت دەوڵەت نیازی باشی هەبووبێت وا ئەو سەربازانەی هێنـابوو، وەک ئەوەی بیهەوێـت بەشـــداریـیـان لە مەڕاســـیمی تازیەبارییەکەی حوسێنی کوڕی عەلییدا پێ بکات، کەچی مەردوومەکە بە شـــێوەیەکی خراپ بابەتەکەیان لێک دایەوە؛ هەروەک دیارە ئەوە نەریتی مرۆڤە کاتێک بێزی لە شـــتێک دەبێتەوە. ســـەریان کردبوو بەیەکدا و چپە و قســـەی ســـەیر و ســـەمەرەیان هەڵدەبەســـت و زیادەڕۆییەکی باشیشیان دەکرد.

گرۆی پرسەگێڕان لە سەرەتادا بە شێوەیەکی ئاسایی ڕادەبووردن؛ هامۆشۆی گرۆی پرسەگێڕان هێشتاکینێ بەکۆتا نەگەیشتبوو، دەنگی تەقە لە شـوێنێکی نەزانراوەوە هات، ئیدی ئەو خەڵکانەشـی کە تێلا و داردەستیان پێ بوو، لێرە و لەوێ کەوتنە وێزەی سەربازەکان.

ئەو هەیوانەی من تێیدا سرەوتبووم، لە سەربازەکانەوە نزیک بوو و، دەمشـــبینی چۆن خەڵکەکە تێیان کەوتوون و میرازیان دەگرن لە کاتێکدا ســـەربازەکان هیچ شـــتێکیان بۆ بەرگری بەدەســـتەوە نەبوو. ئیدی ناچار بوون پشـتوێنەکانی بەرۆکیان بکەنەوە و بەوە بەرگری لە خۆیان بکەن.

لە ســـەحنە هەندێک لە کەســـە دیارەکانی ناوچەکە خەریک بوون بەرگرییان لە ســـەربازەکان دەکرد و قســـەیان بۆ خەڵکەکە دەکرد و دەیانوت: ئەم ســـەربازانەش وەک ئێوە موســـوڵمانن، بەڵام قســـە لەبەردەم ئەو گڕوتینەی جەماوەردا کەڵکی توزێکی نەبوو و وایان لێ هاتبوو، ئەوەی دەیانبیست، تێ نەدەگەیشتن.

ســـەرکردە و ســـەرتیپە ســـەربازییەکان دەمانچەیان پێ بوو و بۆ پارێزگاریی لە خۆ و ســـەربازەکانییان بەکاریان دەهێنا. هەروەک چۆن پۆلیسیش بەشداریی کرد و بە تفەنگەکانیان تەقەیان کرد.

پاشــی ســاردبوونەوەی ئاورگی شــەڕ، بینرا چوار کەس کوژراون. سیان لە خەڵک و دانەیەکیش لە سەربازەکانی دەوڵەت. بریندارى زۆر و زەوندە کە زۆربەیان لە سەربازەکان بوون.

پاش دامردنەوەی جەنگ، تەرمی یەکێک لە ســـیانەکەیان بەناوی (محمد بن عبود المزین) هێنایە سەر سەحنە و خەڵقێکی فرە و فراوانی بەدواوە بوو و لە بەری گشــتیشــیانەوە شــێخ حەســەنی کوڕی شــێخ مەهدی خاڵصی بە دەم هوتافی (بڕوخێ ئینگلیز، نەمێنێ فەیسەڵ)ــەوە پێشــەوایەتیی دەکرد. هەروەها هاواری ئەوەشــی دەکرد (شــیوەن بۆ ئەو برایەتان بگێڕن کە دەوڵەت کوشتوویەتی).

هەروەهـا بە درێژایی ڕێگەکە دەســـتی بە هـاوار و گرمە کرد و جنێوی بە دەوڵەت دەدا. ئەوجا ڕووی دەمی کردە پۆلیســـەکانی ناو ســـەحنە کرد و وتی: (ئەمانە گاور و جوولەکەن). کاتێکیش ویســـترا تەرمەکە لە ســـەحنە ببرێتە دەرێ و بیگەیەننە نەجەف، یەکێـک لە سەربازەکان بەرهەڵستیی کرد، شێخ بەسەریادا هاواری کرد و پرسی: کێ فەرمانی پێ کردووە نەبرێتە دەرێ؟ ســـەرباز وتی: یاریدەدەری بەڕێوەبەری پۆلیس؛ تەواو لەو کاتەدا شـــێخ گرمـاندی: (نەفرەت لە یاریدەدەر و دەوڵەت کە ئێوەی هێناوە هەی گەووادینە!).

## هۆی ڕاستەوخۆ

ڕووداوەکەی سەحنە کۆمەڵێک دەرەنجامی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی نەکەمی لێ کەوتەوە. هەر بەرە و تـاقمێکیش بە هەوا و هەوەســـی خۆیان لێکیان دەدایەوە. بەڵام ئەمیش وەک ســـەرباقیی ڕووداوەکانی ناو مێژوو، دەبێ دوو هۆی یەکێک ڕاستەوخۆ و یەکێک ناڕاستەوخۆی هەبێت. ڕاســـتەوخۆکەیان چەشــنی پرژە ئاگرە کە بە دار و دەوەنەوە

دەنیشـــێت؛ بەڵام هۆی دووەمیان چەشـــنی نزیکیی ئاگرە لە دار و دەوەن.

هۆی ڕاستەقینەی ڕووداوەکە کە لە زاری مەردوومەوە دەبیسترێت، دەشـــێ لە ڕووداوەکەی دواتردا دیاری بکرێت، ئەوەی کە ســـەرتیپی سەربازیی (محي الدين سوهرەوەردی) لەگەڵ تیپێک لە سەربازەکانییدا هاتبوونە ســەحنە، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشــدا هاوســەرەکەیی هێنابوو تا تەماشـــای ڕەوی پرســـەگێران لەبەر هەیوانەکانی ناو ژنانەوە بکات. واش دەردەکەوێـت ئەو خـاتوونە بە زیـادەڕۆیی لە پۆشـــاک و بەخۆوەکردنی خشـڵ و موجەوهەرات ســەرنجی خاتوونەکانی دیکەی ڕاکێشـابێت لەگەڵ ئەو خزمەتەی کە لەلایەن سەربازەکەنەوە دەیکرا و مشـــووری دەخورا. هەر تاو نا تاوێک چەند ســـەربازێک دەچوونە سەرێ بۆ خزمەتی سا بزانن شتێکی پێویستیان نییە دەست و دەم بۆی پەیدا بکەن؟

کـاری قەدەر وابوو، چەنـد منداڵێک لە نزیـک بەرهەیوانەکە بوویە دەمەقرە و هەرایان لەگەڵ چەند خاتوونێکدا و یەکێک لە خـاتوونەکان قریشـکاندی کە گوایە ئەو منداڵە جنێوی بە ئیمام حوسـێن داوە؛ ئیدی منداڵانی دیکە هـاتن بە ســـەر و گوێلاکیدا و باش باشـــیان کوتی. ئەوەبوو ژنێـک لەنـاو ژنەکـانی ســـەرەوەدا بەزەیی و ســـۆزی بۆ تێهەڵدراوەکە جووڵا و بە منداڵانی دیکەی وت کە دەســـت هەڵگرن و لێی نەدەن، کەچی لەناو ژنەکانی دیکەدا هـاوار و نەڕە بەرز بوویەوە و بوویە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی ئەوانی دیکە.

هەندێ لە مەردووم ویسـتیان بچنە ســەرێ بۆ بەرهەیوانەکە؛ ئەو ســـەربازەشـــی بەرهەڵســـتی کردن و نەیدەهێشـــت بچن، ڕایان ماڵی و لێیان دا و ڕێگەیان کردەوە. کە گەیشـــتنە ســـەرێ، ژنان چیرۆکی منداڵەکەیان بیر چووبوویەوە و دەستیان بۆ ژنێکی غەریبەی سوچێکی بەرهەیوانەکە ڕاکێشـــا. ئەو ژنەش ئەوەی ســـوهرەوەردی بوو. ئیدی

خەڵکەکەش لێی نزیک بوونەوە و هەندێ قسەی سارد و ڕەقیان نا بەسەر دڵیەوە.

هەر کە دەنگی هەرا و گۆڵمەز گەیشتە گوێی سوهرەوەردی، خێرا بە سەربازەکانییەوە خۆی گەیاندە بەر هەیوانەکە و دەمەدەمێیەک لەنێوان ئەو و مەردوومەکەی ئەوێدا کرا. یەکێکیان بەو تێلایەی بەدەستییەوە بوو، دانەیەکی تێ سرەواند، ئەویش بە دەمانچەکەی بەرکەمەری، سێ گوللەی حەواڵە کرد کە یەکێکیان بەر کابرایەک بە ناوی (نەجمەدین هادی) کەوت و ڕۆژی دواتر لە نەخۆشخانە گیانی سپارد!

ڕووداوێکی لەم شێوەیە ئەستەمە هەروا بە سەلامەت ڕابگوزەرێت. ئەمە پزیسکە ئاورێکە لە نزیک شارایەک پووش و پەڵاش کە هەر چرکە ئامادەی گرگرتنە کە خۆی لەو تێڵا بەدەستانەدا دەبینێتەوە کە لە سەحنەدا هاتوچۆ دەکەن و هەمیشە کوتەکەکانیان بۆ دۆخێکی لەو شێوەیە لە ئاودایە.

## هۆی ناڕاستەوخۆ

مەردوومی ئەوسای عێراق لەسەر ئەوە خوویان گرتبوو کە هەر ڕووداوێکی چەشنی ئەوەی سەحنە بقەومێ، بیخەنە ئەستۆی ئینگلیز. کەچی ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە، دوای ئەوەی دەستم لە بەڵگەنامەکانی ئینلیز گیر بوو، بینیم ئەوانیش ناویانەتە ملی مەلیک و دەستەودایرەکەی. دیارە لەو دەم و ساتەدا نێوانی مەلیک و ئینگلیز فیلی پێدا دەچوو و ئینگلیز گومانی خراپی بە مەلیک دەبرد و گشت جۆرە تۆمەتێکی بەتەنگەیەوە دەنا.

ئەو ڕایەی کە من پەسـەندی دەکەم و مەیلم بەلایدا دەچێ ئەوەیە کە نە کاری ئینگلیزە، نە کاری مەلیک، بەڵکوو چەند هۆیەکی دیکەی هەیە کە زلترینیان ئەو غەوغایەیە کە هەوسـاری بەدەسـت کوتەک بەدەستەکانەوەیە؛ ئەوەی کەمێک لەمەوبەر باسم کرد.

ئەوەی تەماشـای کۆبوونەوە جەماوەرییەکان لە ڕۆژە پیرۆزە ئاینییەکاندا بکات، تێبینی ئەو مەیلە غەوغاییە زۆر بەئاشکرا دەکات و دەبینێت. هەروەک زۆر بەڕوونییش تێبینی کوتەک بەدەسـتان دەکات لەناو جەماوەرەکەدا هامۆشـۆیانە و هەڵدەگەڕێن و دادەگەڕێن و بۆ نووکە دەرزییەک هەل دەگەڕێن کوتەکەکانیان بوەشێنن.

کەسانی لەو چەشن و کلۆجە بە شێوەیەکی گشتی بە نزم و پەست ناویان لە کۆمەڵگەدا داخسـتووە. ئەوجا بۆیە ئەو ڕۆژانە بە هەل دەقۆزنەوە تا کەمێک پێگەی نزمی خۆی بەرز بکاتەوە؛ هەر بۆیە لەو ڕۆژانەدا دەبینرێ بە عینجە فینجە و تێلای دەسـتییەوە دێت و دەچێت و دەیەوێت بە کوتەکە دارینەکەی دەسـتی خەڵکەکە ڕێک بخات گوایە ڕێکخسـتنی خەڵکەکە نراوەتە ئەسـتۆی ئەو. ئیدی خوا نەکا موویەک لاری لە یەکێک ببینێت، بەتایبەت ڕەشـۆکەکان، خێرا کوتەکی لێ هەڵدەبڕێت و ئەگەر زانی دۆخەکە لەبارە و خەڵکی ڕوویان لێیەتی، دەیوەشـێنێت. هەر ئەوەندە نا، بەڵکوو دەبێت بزانرێت ئەم جۆرە کەسانە لەڕووی ئالۆشی ژێرسکیشەوە تینوون و لەم ڕۆژە ئاینییانەدا بۆ هەلێک دەگەڕێن تا ژێرسـکیان کەمێک دامرکێننەوە. خوا نەکا ژنێک لە بەرهەیوانەکانەوە تەماشایەکی بکەن، ئیدی فووی تێ دەبێت و وەک پاڵەوانی حەوت ئەفسـانە خۆی دەبینێتەوە و خەیاڵ دەکات لە هەموو لایەکەوە قامکی بۆ ڕادەکێشن.

ئێمە ناتوانین بەتەواوی لە ڕووداوەکەی سەحنە بگەین تا بەجوانی لە کەسـایەتیی کوتەک بەدەسـتان نەگەین. هۆیەکی دیکەش هەیە کە نابێت نادیدەی بگرین، ئەویش ڕۆچوونی زیاد لە پێویسـتی سیاسـیی

خەڵکەکە وەک ئەوەی لە بەشـی پێشـوودا باسـمان کرد. ڕەشـەخەڵک وایان لێ هـاتبوو پشــــتگیریی هەر کەســــێکیان دەکرد کە دژایەتیی دەوڵەتی بکردایە و بێزیشـیان لە هەر کەسـێک هەڵدەسـتا کە یارمەتیی دەوڵەتی بدایە. بەڵام کاتێک ئەم کارەیان دەکرد کە هیچ مەترســــییەک لەگۆڕێ نەبووایە؛ خۆ ئەگەرەکینەی مەترســـییەک بهاتایەتە گۆڕێ، بە چاو پرتاندێک دەچوونەوە ســــەر مەزهەبە کۆنەکەیان (بە من چی) و (ئەوە کەی پەیوەندیی بە منەوە هەیە) و ئەو جۆرە وتانە.

دەشـێت بە شـێوەیەکی گشـتیی ئەوە بوترێت کە ڕەشـەخەڵک لەناو کۆمەڵە ئاینییەکاندا هەسـتـــت بە ئازایەتیی دەکەن و ترســــیان کەم دەبێتەوە. هەر بۆیەشە هەوەسی غەوغا لە سەریان دەدات و لەوێڕا بە هەموو دەهۆڵێک دەکەونە سەما و بە گشت بایەکیش دەشەکێنەوە هەر بەو شـــێوەیەی کە ئیمام عەلی باســـی کردوون. ئەمەش بەتەواوەتی ئەوەیە کە لە ڕووداوەکەی سەحنەدا قەوما و، لە ڕووداوگەلی دیکەشدا کە دواتر دێینە سەریان، قەوماوە.

## ٩

## ڕووداوەکەی چلە

### چۆن چاو بە فرمێسکەکانی حوسێن بوونە شەڕکەرە خێڵەکییەکان؟

خەڵکی کازمییە پاش لە ڕووداوەکە، چوونە سەر سەحنەی عەبباسی کوڕی عەلی و سەرکەوتنی خۆیانیان بەسەر خەڵکی نەجەفدا ئاشکرا کرد!

شێخ حەسەن سوهەیل هەوڵی ئاشتەوایی دا و سەرنەکەوت و... هەرا هەر بەردەوام بوو.

لە ساڵی ١٩٢٩ دا لە کەربەلا، ڕووداوێکی هاوچەشنی ئەوەی سەحنە لەو ڕووەوەی کە تەواو غەوغایی بوو ڕوویدا؛ بەڵام ڕووداوەکە تەواو ڕووداوێکی کۆمەڵایەتیی بوو و هیچ نەدەچوویەوە سەر سیاسەت.

لە دەمی چلەی ماتەمینیی کوژرانی حوسێنی کوڕی عەلییدا قەوما! ئەو ماوە و ڕۆژانەی کە خەڵکی وا ڕاهاتوون بچنە سەر گڵکۆ و مەزاری حوسێن لە کەربەلا کە دەکاتە چل ڕۆژ پاش شەهیدبوونی لە سارای کەربەلای پڕ دەرد و بەڵا. لەو دەمەدا کەربەلا لە زیارەتچی کە لە پەڕانپەڕی شار و ناوچەکانی عێراقەوە بۆی دێن و لە قافڵەی پرسەگێران بە زنجیر و شەللاق لەخۆیان دەدەن و بۆ حوسێن شین دەگێڕن پڕ دەبێت..

ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٢٩ و لە ٢٧ـــی تەموززدا کە دەیکردە ٢٠ـــی سـەفەرمانگی ١٣٤٨ی قەمەری، هەلم بۆ ڕەخسـا لەگەڵ زیارەتکاراندا ڕێم بکەوێتە کەربەلا. لە دەمەوعەسـری ڕۆژی پێشـتردا کاتێک بە شەقامێکی پڕ لە خەڵکیدا ڕادەبووردم، دەنگی گوللەی دوور بە گوێمان گەیشـت؛ مەردووم وەک شـارە مێروولەی ئاو تێچوو لە ترسـان هەریەکە بە شـوێنێکدا وون بوو. منیش لەگەڵ ڕاکردوواندا ڕام کرد و لەوماڵەی تێیدا دەماوە، خۆم مەڵاس و قرِ و قپ کرد و نەمزانی چیدی چی قەوما.

لە دواییدا ڕوون بوویەوە شـەڕ و هەرا لەنێوان پرسـەگێرانی کـازمییە و نەجەفـدا بەرپـا بووە و یەکێکیش بەنـاوی (دەعبول) لە نەجەفییەکان کوژراوە و چەندۆکەیەکیش زەخمی هەن. دەس و دەم خەڵکی نەجەف بڕیـاریـان دا کەربەلا بەجێ بهێڵن تـا دەرگـای فیتنە داخرێ کە ئەو کارەیان زۆر دانایانە و لەکارزانانە بوو؛ کەچی خەڵکی کازمییە ئەوەیان بە دۆڕان ناو برد و، دەستیان بە هۆنینەوەی شیعری سـەرکەوتن و بەخۆدا هەڵگوتن کرد؛ تەنانەت تاقمێکیان چوونە سـەر خێوەتە چۆڵەکـانی خەڵکی نەجەف و فنجـانە قـاوەی تۆخیـان تێـدا خواردەوە. ئەوەش نەریتی ناو بیابانە کاتێک هۆزێ بەسـەر یەکێکی دیکەدا سەر دەکەوێت، وا دەکات.

دەنگوبـاس وابوو، تـاقمێکی دیکەی خەڵکی کـازمییە پـاشـی ڕووداوەکە، ملی ڕێی سـەحنەی عەبباسـیان نا کە نزیکی مەرقەدی حوسێنی برای بوو؛ لەوێ عەبباسیان دەدواند و خەبەری سەرکەوتن و شـانازییەکانی خۆیانیان بەسـەر نەجەفییەکاندا بۆ دەگێڕایەوە کە لە یەکێک لە هۆنراوە شانازییەکاندا ئاوایان دەگووت:

یا العباس یا العباس ما ضل مشهدی بالصحن

قتلنا دعبول وطلعن خواته یصین

(هۆ عەبباس! گەر دەتبینی لە سەحنە چۆن دەعبولمان کوشت و ئەوانی دیکەش دەم بە هاوار دەرکران!)

لە سبەینێی ئەو ڕۆژەدا، واتە لە ڕۆژی چلەدا، توانیم شوێنێک لە سەربانی یەکێک لە خانەکان بگرم کە دەیڕوانی بەسەر گرۆی پرسەگێڕاندا... بینیم کازمییەکان لە یەک قەوارەدا خۆیان خڕ کردبوویەوە لە کاتێکدا پێشتر پارچە پارچە بوون و بەو شێوەیەش کە باو بوو، خۆیان نەدەکوتی و سینەزەنییان نەدەکرد؛ بەڵکوو دەستیان بەرەو سەر هەڵبڕیبوو و هێمای سەرکەوتنیان پێ نیشان دەدا و خۆیان هەڵ دەنا و ئەم بەیتە فەخرەیان دەگوتەوە:

حی روایا الکواظم حی أهالیها

قاصدة للطفوف تزور والیها

## لێکەوتی ڕووداوەکە

پاشی تەواوبوونی ماوەی پیرۆز کە گەڕامەوە، بینیم خۆشییەکی ئاشکرا بەسەر ڕووخساری زۆرینەی مەردوومە ئاساییەکەوەیە. هەر تاو نا تاوێکیش یەکێک خۆی دەکرد بەناو بابەتەکەدا و هەواڵی سەرکەوتن و بەرزبوونەوەی شان و شکۆی خەڵکی کازمییەی لە دیوانی هۆزەکانی دەوروبەردا دەگووتەوە.

هەر ئەو ڕۆژە لە کازمییە ڕێم کەوتبوویە تەعزێخوانییەکی ئیمام حوسێن؛ دیتم کابرایەکی خەڵکی نەجەفیشی لێیە، بەڵام جێگەی گاڵتە و چاوەقرتێی خەڵکەکەیە و ئەویش بەهەزار حاڵ خۆی بۆ گیراوە و لەبەر تەنهاییەکەشی هیچی پێ نەدەکرا. ویستم بەرگریی لێ بکەم بەو

بیانووەی لە پرسەی حوسێنی شەهیدیدا دانیشتووین و شیاو نییە دەست بە لاقرتێ و مەسخەرە بە یەکدی بکەین بەو شێوەیەی کە لە سەردەمی نەفامییدا کراوە، کەچی مەردوومەکە منیشیان وەک ئەو بە حەپۆل زانی و چییان بەو کرد، بە منیشیان کرد. بۆخۆی منیش بێدەنگ بووم و وازم لە کابراش هێنا بۆخۆیان چی پێ دەچەژن بیچەژن!

نەفرەت و دووژمنایەتیی نێوان کازمی و نەجەفییەکان تا چەند ساڵێک پاش ڕووداوەکەش درێژەی کێشا. خەڵکی نەجەف داوای خوێنبایی (دەعبول)یان دەکرد؛ کوڕە گەنجەکەی لە شەڕەکەدا تیا چووبوو.

لە ساڵی ١٩٤٥، هەندێک لە دیار و ماقووڵانی کازمییە لە ماڵی یەکێک لە خۆیان کۆبوونەوە تا بەشکوو ڕێچارەیەک بۆ دووژمنایەتیی ئەو دوو شارە بدۆزنەوە و ئاو بە ئاوردا بکەن؛ کەچی لەسەر ئەوە بوویە ناکۆکییان کە کام لایەن بچێتە سەردانی کام لایەن بۆ ئاشتەوایی. لە کۆتاییدا گەیشتنە ئەوەی بچن و لە کەسێکی نەریتزان بپرسن کە دەبێت چی بکەن. ئەو کەسەش شێخ حەسەن سوهەیل، سەرۆکهۆزی بەنی تەمیم کە بوویە دادوەریان.

کاتێک هەمووان جەم بوونەوە، شێخ وتی: ئەوانەی لە خێوەتی ئەوانی دیکەدا پێکی قاوەیان هەڵداوە دەبێ بچنە لای ئەوی دیکە بۆ ئاشتەوایی! بەڵام خەڵکی کازمییە کە ئەمان قاوەیان هەڵدابوو وەک کەمێک لەمەوبەر باسمان کرد، بەو پێشنیارە ڕازی نەبوون. ڕایان لەسەر ئەوەبوو، هەردووک لا لە کەربەلا کۆ ببنەوە؛ بەڵام نەجەفییەکان بەم ڕایە قاییل نەبوون چونکە پێچەوانەی نەریتی عەشایەری بوو.

ئیدی هێشتاش تۆڵەی دەغبوول نەسەنراوەتەوە!

## لێکدانەوەی کۆمەڵایەتی

هۆی ڕاستەوخۆ و ئاشکرای شەڕ و هەراکەی چلەی ئیمام ئەوەبوو کۆمەڵێکی کازمی و نەجەفی لەسەر ئەوەی کێ لە پێش و کێش لە دواوەی ڕیزی ماتەمگێران دەبێ، ببوبە هەرا و قیرەیان. ئەوان ئەو کاتەی بەر ببوونە گیانی یەکتر، بیریان چووبوویەوە کە بۆ زیندووکردنەوەی یادی شەهیدبوونی حوسێن هاتوون کە ئەو سەر و ماڵی لە ڕێی ئاییندا دانا.

ئەمان لە چرکەیەکدا لە گریان و فرمێسک ڕشتن بەسەر حوسێندا گۆڕان بۆ خێڵەکییەکی دەمارگرژی شەڕکەر. دەشێ بڵێین: مەیلی خێڵەکی لە مەیلە دینییەکەیان زۆر بەهێزتربوو تێیاندا.

ڕاستییەکەشی ئەوەیە، ئەم ڕووداوی چلەیە شتێکی نامۆ و تاقانە نەبوو لە کۆمەڵگەی عێراقی یان هەر کۆمەڵگەیەکی هاوشێوەی عێراق لە ڕووی بنیاتی کۆمەڵایەتییەوە. ئەمن لە گەورە و پێشینانی خۆمانم زۆر لەم ڕووداوانە بیستووە کە لەناو خەڵکیدا بەڕووالەت بە دینەوە هەڵواسراوە، کەچی هۆ و پاڵنەری گەورەی ڕاستەقینەی گیانی خێڵایەتی بووە.

هەر لەم تۆپە قووماش و ڕوداوە، بەبیرم دێت لە ساڵی ١٩١١ هەواڵ گەیشتێ کە ئیتاڵیا دەستی بۆ تەرابلووس و لیبیا درێژ کردووە کە ئەوسا بەشێک بوون لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی. لە ٣٠ـی ئەیلوولیشدا لە ئەستەبوولەوە بەرقییەیەک لە سوڵتانەوە گەیشتە والی بەغدا کە ئیتاڵیا هێرشی کردووە و با تۆش خەڵک بۆ جیهاد و سەرخستنی دەوڵەت هان بدەیت. والییش بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوە کە هەرکەس بەپێی توانای خۆی لە سەرخستنی دەوڵەتدا پشکی هەبێت!

بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم بەیاننامە، خۆپیشـــاندانی گەورە بە تەپڵ و بەیداخ و بانگی جیهادەوە لە بەغدا بەرپا کرا. ئا لەو کاتەی ئاپۆرەی خەڵک و تاقمەکان بەلای دەرگای باکووردا تێپەڕ بوون، دەمەقاڵێیەک لەنێوان دوو بەرەدا کە یەکێکیان تاقمی (باب الشیخ) و ئەوی دیکەشیان (حەیدەرخانە) بوو ڕوویدا و شـــەڕ و هەرا گەرم بوو و ســـەرکەوتن بوویە بەشی (باب الشیخ)ـەکان.

ئەوانەی بەشـداریبیان لەم خۆپیشـاندانەدا کرد، مەبەسـت و مرازی دڵیـان پشـــتیوانی بوو لە دەوڵەتی عوســـمـانی کە بەلای ئەمـانەوە نمایندەی ئیســـلام دژی کافران بوو، کەچی خێرا ئیســـلامیان بیر چوویەوە و چەشنی دەوارنشینەکانی سەردەمی نەفامی دەستیان دایە یەخەی یەکدی.

لە ٢٠ـــــی کانوونی دووەمی ١٩١٢ـــــشـدا شـتێکی هاوشـێوە لە ســـەحنەی کازمییە بەبۆنەی عاشـــووراوە لەنێوان تاقمێکی کەرخی و کازمییدا قەوما. گۆڤاری (لغة العرب) باســـی ئەم ڕووداوەی کرد کە گۆڤارکە لەو ماوەیەدا لە بەغدا دەر دەکرا. لێرەدا دەقی نوســـراوی گۆڤارەکە ڕادەگوێزم: (لە کازمییە و لە قوڵەی نیوەڕۆی ٢٠ـی کانوونی دووەم ڕووداوێکی دڵتزێن قەوما کە دڵی هەموو هۆشـمەندێکی تەزاند. ڕووداوەکەش بەم شێوەیە کە کۆمەڵێک لە موسوڵمانان لەوێ بۆ یادی عاشـوورا جەم ببوونەوە. لەناو ئەوانەشـدا تاقمێکی کەرخی ئامادەبیان هەبوو؛ ئەوجا لەناو ئەو تاقمەدا نەریتێکی زشت هەیە کاتێک تەماشای خەڵکی دەکەن خێرا دەپرســـن کێ لە کام گەڕەک و کێ کوڕی کوێیە؟ کـاتێکیش ئەم پرس و جۆیـانە درێژە دەکێشـــن، ڕق و بێز لەنـاو خەڵکەکەدا هەڵدەستێنێت؛ ئەم ڕقە هەر لەو قۆناغەدا نامێنێتەوە، بەڵکوو خۆی لە جنێو و نەفرەتدا دەبینێتەوە؛ پاشـــان خۆ زیت کردنەوە و پەلامار و ئەوجا لێدان و کوتان و دواتر برینداربوون و عومری خوا کردن. هەر ئەمەش لە کـازمییەدا ڕوویـدا. کـاتێـک هەنـدێـک لە

بێمێشــکەکانی کازمییە زانییان فڵان و فیســار هی کەرخن، دەســتیان کردە پیتک و پلار پێوەنان و دەســتەوئێخە بوون و یەکتریان کوتی و بریندار کرد و ... سەرەنجامیش دانەیەکی کازمی کوژرا و سیانیش لە کەرخییەکان بریندار بوون و بە تۆمەتی کوشــتنیش کۆمەڵێک خرانە ژووری. هیوا وایە ئەمە کۆتا ڕووداوی لەم چەشــنە بێت بە هیممەتی دەوڵەت و چیدی شتی لەو شێوەیە نەقەومێت.)

ڕەنگە جێگەی خۆی بێت ئاماژە بەوە بکەم کە باوکم یەکێک بوو لە بریندارەکانی ئەو ڕووداوە؛ بەڵێ خەنجەرێک بەر پشــتی کەتبوو کە نزیکی مەرگی کردبوویەوە تا خودا یەکێکی بۆ ڕەوانە کردبوو و بە ئامرازە بەردەســتەکانی ئەوســا و نەیهێشــتبوو شــەربەتی مەرگ بنۆشــێت. خۆ ئەگەرەکینەی ئەو بکوژرایە، فرســەت بۆ نوســینی ئەم دێڕانە بۆ نوسەرەکەی هەڵنەدەکەوت!

## ١٠

## لەنێوان دین و خێڵ... و شەقاوە

ئەو واقیعانەی لە بەشـــی پێشـــوودا باســـم کردن، دەبنە مایەی ڕاکێشـانی سـەرنج چونکە مەردووم لە هەڵسـوکەوتەکانیاندا دووفاقن. تاوێ دیندار و تاوێک خێڵەکین. ئاشکراشـە جیاوازییەکی فرە و فراوان لەنێوان ڕەفتاری ئایینی و ڕەفتاری خێڵەکییدا هەیە.

بەندە لە دەورانی تازەلاوی و جاحێڵیمدا زۆر ســـەرم لە جیاوازیی ئەو دووانە نەدەکردەوە. خۆشم لەسەریان ڕاهاتبووم و واشم دەزانی شتێکی سروشتییە و هیچ نامۆییەکی تێدا نییە! کەچی کاتێک سروشتی مرۆڤم خوێندەوە، تێگەیشتم ئەم شتانە هەر دەبێت هۆ و شیکارییەکیان هەبێت و هۆی کۆمەڵایەتییان لەپشتەوە بێت تا بجۆشێن.

**بۆچی؟**

یەکەمین پرسـیارێک لەم بارەیەوە توشـمان دەبێت بە تووشـییەوە ئەوەیە: بۆچی نەریتە خێڵایەتییەکان لەو ســـەردەمەدا باڵی بەســـەر خەڵکەکەدا کێشابوو؟

بۆ وەڵامی ئەوە دەشـــێت بێژین: عێراق پاشـــەوپاشـــی ڕووخانی دەوڵەتی عەبباســـــی، بۆ ماوەی شـــەش ســـــەدە تووشـــی دارمانی شارستانی بوو. ئەدی لەو دەورانەشدا دەسەڵاتی دەوڵەتی پارێزگاریی لە ڕۆح و گیـانی هـاووڵاتییـان نەدەکرد، نـاچـار مەردووم پەنـایـان بردووەتە بەر بەها خێڵەکییەکان تا پارێزراو بن و لەوساوە نەریتەکانی دەمـارگیری و پەلامـار و فەرهوود و خوێنبـایی و شـــۆردنەوەی شوورەیی و شتانی هاوتۆیی ئەمانەیان تێدا زیت و زەق بوویەوە.

ئەوەی خۆ نەدایەتە پەنا یەکێک لە هۆزەکان تا بیپارێزن، بە ڕۆژی ڕوشـــنا ســـەر و ماڵی بە غارەت دەبرا و ئەوەش لە لادێ و ناوچە کەنارییەکاندا تا ڕاددەیەکی زۆر ڕوون و ئاشـکرا بوو؛ هەروەک چۆن لە شارەکانیشدا بەڵام بە شێوەیەکی کەمتر.

هەر لەو سـەردەمەی کە بەها خێڵەکییەکان لەناو خەڵکیدا مەوجیان دەدا، کۆمەڵە بەهایەکی دیکەش هەبوون پێیان دەگوترا بەهای دینی کە لەلایەن واعیزەکانی مزگەوت و وتارویژانی پرسە و کۆبوونەوەکان بۆ حوســـێن چەشـــنی یەکســـانی و دانبەخۆداگرتن و لێبووردەیی و خۆپارێزی دەوتران کە پێچەوانەی بەها خێڵەکییەکان بوون.

لە دەورانی عوســمانی و دەورانی دوای ئەوانیشــدا، منداڵان کاتی بەتـاڵی خۆیـان لە کۆڵانـدا ڕادەبوارد. لە دیـارترین هۆکـاری کـات ڕابواردن و گەمە و گاڵتە یارییەک بوو پێی دەوترا (شـــەڕەگەڕەک). منـداڵانی ئەم کۆڵانە دژی ئەوانەی کۆڵانی ئەودیو تێک بەر دەبوون دوای ئەوەی منـداڵانی هەر گەڕەکێـک کۆمەڵی شـــەقوەشـــێن و چاونەترسی خۆی کۆ دەکردەوە. لە شەڕەکانیشیاندا بەرد و کوتەکیان بەکار دەهێنا. خۆ ئەگەرەکینەی یەکێکیـان بەســـەر ئەوی دیکەیـاندا سەرکەوتایە، ئەوە دەبوویە مایەی شـانازیی و خۆهەڵکێشـانی براوە و هەر تاو نا تاوێکیش شـــریتی ســـەرکەوتنەکەیان بۆ ئەم و ئەو لێ دەدایەوە.

بیرمە لە ســـەردەمی منداڵیمدا، لەناو منداڵاندا شـــانازی بەوەوە دەکرا کە کێ (پـاڵەوان) و کێش (بوودەڵ)ـــــــە. پـاڵەوان ئەوەبوو دەیوەشـــاند، نەیدەخوارد؛ دەیبرد، لێی نەدەبرا. زیرەک ئەوەبوو بتباتە ســـەر کانی، ئاوت نەدات بتهێنێتەوە. ئەو بە زیرەکییە شـــەیتانییەکەی دەیتوانی لەســـەر کانییەکە وەها ســـەرگەرمت بکات، بیرت بچێتەوە کە تینووت بووە.

ئەوەی لە منداڵییدا لەسـەر بەهایەکی لەم شـێوەیە گۆش بووبێت، شکی تێدا نییە لە سەردەمی گەورەییشدا کەم تا زۆر تێیدا دەمێنێتەوە. بەڵام گرفت لەوەدایە لە گەورەییدا وتار و وەعزی زۆری لە مزگەوت بەسەردا دەخوێنرێتەوە. بۆیە دەبینین لە ڕوواڵەتدا پێی کاریگەر دەبێت و خۆشـی بەسـەر کەسـانی دیکەدا دەیخوێنێتەوە، یان لەسـەر بنەمای ئەمانە ڕەخنە لە کەسانی دیکە دەگرێت، کەچی لە ژیانی کردەیی خۆیدا بیری دەچێتەوە و خول خول دەچێتەوە سـەر ڕەوڕەوەی بەها خێڵەکییەکان.

## پێگەی شەقاوە

وشـەی (شـەقاوە) مەبەسـت پێی ئەو کەسـەیە کە نەریتە خێڵەکییەکان تێیدا شەوق دەدەنەوە لەو ڕووەی کە بەهێزە و دەتوانێت بوەشـێنێت و ماڵ تاڵان بکات و ڕێ بگرێت و پارە لە دەوڵەتمەندان بکێشـێتەوە؛ لە هەمان کاتیشـدا گەڕەکەکەی خۆی لە گەڕەکانی دیکە دەپارێزێت و ناهێڵێت کەس دەستی بۆ درێژ بکات!

یەکێک لەو شـەقاوە ناسـراوانەی کازمییە هاوسـێی ماڵی باپیرم سەیید موحسین ببوو. چەندینجار لە خزم و خوێشانەوە باسی چاکەی ئەو کابرایەم لە چەندین ڕووەوە بیسـتبوو. ئەو پاسـەوانی بەرقاپیی باپیرم و سەرباقیی ماڵەکانی گەڕەک بوو. ببڕای ببڕ ڕێگەی نەدەدا دز توخنی ئەو ناوچەیە بکەوێت چونکە بە شـووڕەیی سـەر خۆی دەزانی و لە پیاوەتییەکەی کەم دەکردەوە.

لە دەورانی جاحێڵیمدا شـەقاوەکانم لە کۆچە و کۆڵانان دەبینی کە ڕۆیشـتن و پۆشـاکی تایبەت بە خۆیانیان هەبوو؛ مەردوومیش دەستیان بۆ بە سنگەوە دەگرتن و ستایش و پەسنیان دەکردن. منیش

هاوڕێیەکم هەبوو، هەموو خەون و خەیاڵی ئەوەبوو کە گەورە بوو، ببێتە شـــەقاوەیەکی ناســــراو. بەڵام من بەداخەوە ئەو ئاواتەم نەبوو چونکە لەشـــم زۆر لاواز بوو؛ پێویســــت بەوە ناکات بڵێم هێزی جەستەیی گەورەترین پێویستیی بوونە شەقاوە بوو لەو سەردەمەدا.

ڕۆژێکیان لە قاوەخانەی گەڕەکەی خۆماندا دانیشـــتبووم هەروا گوێم لە قســــەی گەڕەک گرتبوو کە لەبارەی ئەو وتارەوە دەدوان کە یەکێک لە وتارخوێنەکانی ئەم مزگەوتەی نزیکمان خوێندبوویەوە. ئەوان بەناوی سەرسامی ئەو وتارە بەهێز و ڕەوانەی ببوون کە پێی خوێندبوویەوە و بابەتەکەشی باسی ئەخلاقی بەرز و شکۆمەندانە بوو کە ئیسلام هێناویەتی، چەشنی دادپەروەری و لەخواترسی وخاکساری و پاداشــتی خراپە بە چاکە. تێبینیم کرد هەر لەو کاتەی ئەوان ئەم قســانە دەکەن، شــەقاوەیەکی ناســراو بە بەردەمیاندا ڕابوورد، خێرا میلی قســـەکانیان بەلای ئەو و ئازایەتیی و خوێنخۆرییەکانیدا بادا کە چۆن حەوت دانە لە نەیارەکانی کوشتووە و چ شانازییەکی پێ براوە.

لێرەدا ڕووبەڕووی دوو کەســی دژیەک دەبینەوە کە هەردووکیان سەرنجی خەڵکیان ڕاکێشاوە؛ یەکەمیان کەسایەتیی واعیزە کە خەڵکی بۆ تەقوا و ڕەوشــــت و خۆگری دەکات. کەســـــایەتیی دوەمیش شەقاوەکەیە کە تەواو بە ئاڕاستەی پێچەوانە مل دەنێت. ڕاستییەکەشی ئەو کەســـە خواپەرەســـتە ڕاســـاڵانەی خۆیان بە ئەخلاقی بەرزەوە گرتووە، پێگە و جێگەیان هیچ لە پێگە و جێگەی ئەم شــەقاوەیە کەمتر نییە و ڕێزی تایبەتی دەگرن و هەردووکیان دەستیان بۆ بە سـنگەوە دەگیردرێت؛ ئەمەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی دووفاقی لەنـاو هەندێکیاندا و ئیدی ئەم کەســـە تاوێک تەقواکار و تاوێکیش شـــەقاوە خۆی نمایش دەکات.

تکام لە خوێنەر ئەوەیە ئەمە دووفاقییە تایبەت نەکات بە کۆمەڵگەی عێراقییەوە؛ زۆرێک لە کۆمەڵگەکان، تەنانەت پێشکەوتوەکانیشیان کەم تا زۆر بەم دەردەوە دەناڵێنن. بۆ نموونە کۆمەڵگەی ئەمریکی، دەبینیت کۆمەڵناسەکانیان هەندێک لە دووفاقییان لە کەسەکانیاندا تێبینی کردووە.

یەکێک لەم زانایانە کە ناوی 'کامبڵ یۆنگ'[٧]ە لە کتێبەکەیدا بەناوی (دەروونناسیی کۆمەڵایەتی) دەڵێت: لە کۆمەڵگەکەماندا دوو سیستەمی بەهای ئەخلاقی هەن. یەکێکیان لە بەهاکانی نێو ئایینی مەسیحییەوە وەرگیراوە کە تۆ چیت بۆ خۆت پێ خۆشە و حەزت لێیە چلۆن مامەڵەت لەگەڵ بکرێت، ئاوا لەگەڵ دیگەران مامەڵە بکە؛ دووەمیشیان لە دۆخی ئابوورییەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەم دۆخە تێکشکێنەرە بێڕەحمە. ئیدی ئەوانەی دەکەونە بەر شەپۆلی ئەم جووت سیستەمە، تووشی دووفلیقانەیی لە کەسایەتییاندا دەبنەوە.

---

٧ - کامبڵ یونگ ( ١٨٩٣- ١٩٧٢ز): زانای کۆمەڵناسی ئەمریکی، لەساڵی ١٩٤٥ز دا سەرۆکی بزووتنەوەی ئەمریکی بووە لە بواری کۆمەڵناسی. لەساڵی ١٩١٥ز خوێندنی لەزانکۆی بریگهام یونگ تەواوکردووە. بۆماوەی ساڵێک لە قوتابخانەیەکی دواناوەندی لە ئەریزۆنا پێش دەستکردن بەخوێندنی کۆمەڵناسی لەزانکۆی شیکاگۆ مامۆستا بووە. لەزانکۆی ستانفۆرد خوێندوویەتی و بڕوانامەی دکتۆرای لە دەروونناسیدا لەساڵی ١٩٢١ز بەدەستهێناوە. لەکتێبێکدا بەناونیشانی (المصدر لعلم النفس الاجتماعي (١٩٢٧ز)) دەستەواژەی ( ambivert)ی دروستکردووە بۆ وەسفی کەسێکی کراوە / گۆشەگیر. بنەڕەتی دروستکردنی ئەم دەستەواژەیە بۆ ئەم زانایە دەگەڕێتەوە. دەستی بە ژیانی مامۆستایەتی لەزانکۆی ئۆریگۆن کردووە و دواتر سەرقاڵی وانەوتنەوە بووە لەزانکۆی کلارک. پاشان ئەزموونی وانەوتنەوەی لەزانکۆی ویسکونسین مادیسون دەستپێکردووە. لەساڵی ١٩٤٠ز بووە بەسەرۆکی بەشی کۆمەڵناسی لەکۆلێژی کوینز و لەساڵی ١٩٤٧ز وەکو سەرۆک بەشی کۆمەڵناسی لەزانکۆی نۆرس ویستێرن هەڵبژێردراوە.

جیاوازیی نێوان کۆمەڵگەی ئەمریکی و عێراقی ئەوەتانێ کە بواری دووفاقییەکە لەوێ لەنێوان بەها مەسـیحی و بەها ئابوورییەکاندایە، لەکاتێکدا ئەوەی ئێرە لەنێوان بەها ئیسلامی و بەها خێڵەکییەکاندایە.

## گەران بەشوێن تکاکارێکدا یان ئیمان بە شەفاعەت

هێشـتاشـی بەدەمەوە بێت، بڕوای شـەفاعەت یەکێکە لە دیاردە بەربڵاوە دینییەکانی عێراق و ئەو کۆمەڵگانەی دیکەش کە لە ڕووی پێکهاتەوە لێی دەچن. مەبەسـتیشـم بەم شـەفاعەتە ئەو کارەیە کە خەڵکی دەچنە لای پیاوێکی ئایینی تا لای خودا داوای لێبووردنیان لەو تاوانانە بۆ بکات کە تووشـی بوون. دەشـێ بڵێین: لە هەندێک کاتدا بڕوای شـەفـاعەت و دووفـاقی لە کەسـایەتییـدا دوو شـتی پێکەوەبەستراوی ژیانی کۆمەڵایەتین.

ئیدی ئەو مەردوومە لەژێر کاریگەریی ئەو دووفاقییەدا بە چەندین کاری دزێو و تاوان هەڵدەستن کە پێچەوانەی ئایین و ئەو شتەیە کە خۆیان ئیمانیان پێیەتی. ئەوەش هەمان ئەو شـتە بوو کە لە دەورانی دەوڵەتی عوسـمانی و دواترییدا ڕووی دا؛ خەڵکەکە شـانازییان بە پەلامـار و داگیرکـاری و پـاوانخوازییەوە دەکرد وەک بینیمـان؛ لەملاشـەوە هەستیان دەکرد پێویستیان بە شـەفاعەتکار و تکاکارێکە لای خودا داوای عەفوو و تۆبەیان بۆ بکات سـا خودا لە ئاووری بە کڵپە و بڵێسـەی جەهەنـدەم پەنـایـان بـدات. هەر ئەمەشـە هۆی سەرهەڵدانی ئەو گشتە مەزارە پیرۆزە لە کۆمەڵگەدا کە خەڵکی پارەی تێ دەکەن!

لە قورئـانـدا پەروەردگـار دەفەرموێـت: (بـانگم لێ بکەن، بەدەم بانگتانەوە دێم)، هەروەها (لەگەڵ خودا بانگ لە کەسـی دیکە نەکەن).

ئەمە ئەوە ئاشـــکرا دەکات کە هەرگا بانگ لە خودا بکرێ، وەڵام دەداتەوە بەبێ ئەوەی نیازی بە تکاکار و نێوەنگیرێک بێت. بەڵام ڕەشـــەخەڵک لەمە نەگەیشـــتوون و لە تواناشـــیاندا نەبووە تێ بگەن. ئەمان لە ژینی ڕۆژانەشیاندا دەقیان بەوەوە گرتووە ئەگەر پێویستیان بە شـــتێ بێ لای کاربەدەســـتێک، پەنا و تکا بەرنە لای بندەســـت و ژێردەستەکانی و دیاری و بەخششی گران گرانیان پێشکەش بکەن تا کاریان بۆ ئاســـان بکەن. ئەمانە خوداشـــیان لە هەمان قاڵب داوە و وا دەزانن چەشنی کاربەداستانە و لە ڕێگەی پرسگە و بندەستەوە نەبێت (بە خەڵاتەوە)، کاریان بۆ ماشـی ناکات. ئیدی ئەگەر وا نەکەن، کاریان پاش دەخرێت و پەروەندەیان گەزێک تۆزی بەسەرەوە دەنیشێت!

لە ڕاســـتییشـــدا ئەم بڕوا و ئیمانە بە شـــەفاعەت و تکاکاری، لە سەردەمی عوسمانییەکاندا هەروەک بندەستان لەناو کاربەدەستانیشدا باو بوو. هەروەک پێشتر ئاماژەمان پێدا، کاربەدەستانی ئەو سەردەمە لە گەندەڵترین و بەرتیلخۆرترین و ســـتەمگەرترینی دەســـەڵاتدارانی جیهان بوون. بەڵام لە هەمان کاتیشدا زۆرترین وابەستەی مزگەوت و مەزار و ئەو شوێنانە بوون. ماوەیەک بەغداد وای لێ هات وێرانکاریی گشـــتیی هێندەی ژمارەی گومەز و منارەی مزگەوت و مەزارگەکان زیادی کردبوو.

### حەسەن کبریت

حەســـەن کبریت یەکێک بو لە دیارترین شـــەقاوەکانی کۆتایی ســـەردەمی عوســـمانی کە لە دەورانی داگیرکەریی دەوڵەتی بەریتانیادا کۆچی دوایی کرد. منیش هەر لە منداڵییەوە قســـە و باســـم دەربارەی شەقاوەییەکانی ئەو بەر گوێ دەکەوت.

خولاسەی کەلام ئەوەیە: ئەم کابرایە بە دەردی سادیزم (چێژ بینین لە ئازاری ئەوانی دیکە) گیرۆدە ببوو؛ چێژی لە کوشـــت و بڕ و خوێنڕێژی دەبرد. ئەو هەر بە ڕووتکردنەوە و ماڵ تاڵانکردن و پارە لێ کێشـانەوەوە نەدەوەســتا، بەڵکوو قوربانییەکانیشـی دەکوشـت. کورتەی قســـان، زۆرم لەبارەی کارە ســادیزمییەکانەوە بەر گوێ کەوتبوو. ئەم حەســەن کبریتە بە تەواوی ئیمانییەوە لە کاتی کوشتنی قوربانییەکاندا بڕوای وابوو بەبۆنەی شـــەفاعەتی فاتیمەی زەهرای کچی پێغەمبەری خوداوە (درود و ســـەلامی لەســـەر بێت) دەچێتە بەهەشتی پان و بەرینەوە.

یەکێکی جێ متمـانە بۆی گێڕامەوە، بەر لە مەرگی کبریـت بە ماوەیەکی کەم، چاوی پێی کەوتووە و باسـی کارە شـەقاوەییەکانییان کردووە و پرسـیاری ژمارەی کوژراوەکانی بەدەسـتی لێ کردووە کە بە چ ڕوییەکەوە دەچێتە بەر دیوانی خودا. کەچی ئەو زۆر بەهیوا بووە کە بەر شـــەفاعەتی فاتیمە خانی کچی پێغەمبەری خودا دەکەوێت چونکە کارێکی کردووە شایەنی ئەوەیە بەر شەفاعەتی وی بکەوێت.

ئەو چاکەیەشـــی کە حەســـەن کبریت ئەنجامی دابوو و ببوویە شـایەنی شـەفاعەتی زەهرا ئەوەبوو: شـەوێک لەگەڵ دزانی دۆسـتیدا دابوویان بەســـەر ماڵە زەنگینێکی بەغدادا. کاتێک ئۆپەراسـیۆنی دزی تەواو ببوو، لەگەڵ هـاودەســـتانیدا بەپێ گەڕابوونەوە کازمییە و لە ڕێگەدا دابوویان بەلای مەزاری شێخی ناسراوی ناوچەی کەرخ.

ئەو مەزارگەیە ئەوسـا دوور بوو لە ئاوەدانی؛ حەسـەن کبریتیش لای گۆڕەکانەوە گوێی لە هاوارێک دەبێت کە دەگری و پەنا بۆ فاتیمە دەبات و دامەنی دەگرێت لە کاتێکدا پیاوێک دەیەوێت دەســـتی بۆ بەرێت و بەندوخێنی خۆی بۆ شل بکات! ئا لەو کاتەدا حەسەن کبریت بڕیار دەدات کەســـێکی دیکە بۆ لیســـتی کوژراوەکانی لەبەر خاتری فاتیمەی زەهرا زیاد بکات. ئەدی خەنجەری بۆ دەردێنێت و لە پشـتیدا

نوقمی دەکات و دەم و دەست ساردی دەکاتەوە و کچەش بەبێ هیچ دەسکاری کرانێک دەگەیەنێتەوە بنەماڵەکەی.

لە ڕۆژی دواتردا پۆلیسی کەرخ جەندەکی کابرایان لە قەبرستانەکە دۆزییەوە و دەستیان کرد بە گەڕان بەشوێن بکوژدا. یەکێکیش لە پۆلیسە پشکنەرەکان هاتە کازمییە چونکە حەسەن کبریتی دەناسی و دەیویست یارمەتیی بدات لە دۆزینەوەی بکوژەکەدا. ئەوەبوو پۆلیسەکە حەسەنی لە یەکێک لە قاوەخانەکاندا بینی و سین و جیمی کارەساتەکەیان کرد و حەسەن پێی ڕاگەیاند کە بەڵێ ئەو دەزانێت کێ بکوژە، بەڵام ناوەکەی ناڵێت تا پۆلیسەکە قەسەمی بۆ نەخوات کە هیچ کێشەیەکی تووش نابێت. پۆلیسەکەش سمێڵی خۆی گرت و سوێندی پێ خوارد کە ئەوسا ئەو جۆرە سوێندە زۆر گەورە بوو و هیچ دوودڵییەکی هەڵ نەدەگرت. ئەویش سەروبەری کارەساتەکەی لە سیرەوە تا پیواز بۆ باس کرد و پۆلیسەکەش وتی: مادەم لەبەر فاتیمەی زەهرا ئەو کابرایەت کوشتووە، شەرت بێ منیش لەبەر فاتیمەی زەهرا ناوت نەدەم).

حەسەن کبریت لە سزای کوشتن ڕزگاری بوو!

ئەم نموونەیە وێنەیەکی ڕوونمان لە دۆخی کۆمەڵایەتیی ئەوسای ئەو خەڵک و سەردەمە دەداتێ کە بە دڵی خۆیان چییان حەز لێ بووە بەپێی بەها و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان ئەنجامیان داوە، کەچی بڕواشیان وا بووە خودا بەبۆنەی کەسانی پێگە بڵندی لای خۆی دەیانبەخشێت!

# ١١

# بزووتنەوەیەکی چاکسازی و گاڵەیەک لەبارەی کتێبێکەوە

لە گەرمەی هاوینی ١٩٢٩دا، مقۆ مقۆ کەوتە ناو خەڵکی بەهۆی دەرچوونی نامیلکەیەکەوە بەناونیشانی (رسالة التنزيه لأعمال الشبيه)، کە نوسەرەکەی موجتەهیدێکی دیاری شیعەیە و نیشتەجێی دیمەشقە بەناوی (محسن الأمين العاملي) بوو.

نامیلکەکە ڕەخنە لە تقووسە باوەکانی شیعە لە مانگی موحەڕڕەمدا دەگرێ لەو کاتەی یادی شەهیدبوونی ئیمام حوسێن دەکرێتەوە. بە بڕوای ئەو موجتەهیدە، ئەم تقووسانە، بێجگە لەوەی زیان بە تاک و کۆمەڵگەش دەگەیەنن، ناوبانگی شیعە دەزڕێنن و بۆ پشتگیریی ئەم قسەیەشی، وتەیەکی ئیمام جەعفەری سادق دێنێتەوە کە وتوویەتی: (شیعەگەل، ببنە جوانی نەوەک زشتی و خەوشی؛ سا بەشکوو دواتر بڵێن: سەد ڕەحمەت لە جەعفەری کوڕی موحەممەد بۆ ئەو تەربێتەی کە هاوەڵانی خۆی پێ داداوە).

ئینجاکونێ خەڵکەکە بوونە دوو بەرە و تاقم؛ زۆرینە بەر نەفرەت و تانە و توانجیان خست و کەمینەش بوونە پشتیوانی. ئەمە دیاردەیەکی فرە ئاساییە لەناو گرۆی مرۆڤدا بەو پێیەی لەبارەی سروشتی مرۆڤەوە تێی گەیشتوین. هەر دەبێت هەر بزووتنەوەیەکی چاکسازی و نوێخوازی لەلایەن زۆرینەی خەڵکییەوە بەرتەک بدرێتەوە چونکە پێچەوانەی ئەوەیە- کە باوک و باپیریان بەپێی گوزارشتە قورئانییەکە- لەسەری بووە.

ململانێی یار و ئەغیار لە کازمییەدا تەشەنەی سەند؛ کار خۆی بە شوێنێک گەیاند، هەندێک ڕەشە خەڵک بە کوچە و کۆلاناندا دەگەڕان تا بزانن کێ لایەنگری سەیید موحسین ئەمینە بۆ ئەوەی کەمێکی تێ بسرەوێنن. لێتانی ناشارمەوە، بەندە یەکێک بووم لە لایەنگرانی ئەو بزووتنەوەیە، بەڵام لە سووچێکی دڵی خۆمدا قاییمم کردبوو و بۆ کەسم باس نەدەکرد مەگەر جێمتمانەکانم. بە کورتییەکەی خۆم لە پەلاماری ڕەشەخەڵک دەپاراست.

ململانێکە لە نەجەف زۆر بەتین‌وتاوتر بوو. ئەوەتا نوسەری بەناوبانگ، جەعفەر ئەلخەلیلی لە بەشی یەکەمی کتێبی (هکذا عرفتهم) بۆمانی باس دەکات. ئەو یەکێک بووە لە لایەنگرانی و زۆر بوێرانەش ڕای خۆی دەربڕیوە و تەنانەت لە ڕۆژنامەی (الفجر الصادق) کە ئەوسا لە نەجەف دەردەکرا، ڕای خۆی گوتووە.

جەعفەر ئەلخەلیلی لە کتێبەکەیدا دەڵێت: (ڕەشەخەڵک لە نەجەف بە پشتیوانانی بانگەوازەکە دەڵێن (ئەمەوییەکان)، هەروەک چۆن بە نەیارەکانیشی دەوترێت (عەلەوییەکان). ئاوگێرانی ناو شیوەنکۆڕی حوسێنیش لەگەڵ گەڕاندنی ئاوەکەدا دەیانگوت (نەفرەتی خودا لە ئەمین – ئاو)، لە کاتێکدا پێشتر دەیانوت: (نەفرەتی خودا لە حەرمەلە – ئاو).

## باسایەکی کۆمەڵایەتی

وتارخوێنانی پرسەی حوسەینی لە گشت لایەک زیاتر هێرشیان دەکردە سەر بانگەوازەکەی سەیید موحسین ئەمین. ئاخر ئەو لە کتێبەکەیدا ڕەخنەی ئەوەی لێ گرتبوون کە زیادەڕۆیی و درۆ لە گێڕانەوەی هەواڵە مێژووییەکاندا دەکەن بۆ ئەوەی زیاتر سۆزی

خەڵکی بجۆشێنن و زیاتر بیانگرێنن. ئەوەبوو سەیید ساڵەح ئەلحیللی کە یەکێک لە دیارترین وتارخوێنانی پرسەکانی ئیمام بوو، شەپۆلە هێرشێکی بۆسەر سەیید موحسین ئەمین دەست پێکرد لە گشت ئەو پرسانەی وتاری تێدا دەخوێندەوە. شیعرێکیشی لێوە بەناو مەردوومدا بڵاو بوویەوە کە زەمی سەیید موحسین دەکات و دەڵێت:

يا راحلا اما مررت بجلق

فابصق بوجه أمينها النتزندق

ئەی رێوگار، ئەگەر بە ناوچەی "جیلق"دا تێپەریت، تفێ بکەرە نێوچەوانی ئەمینە زەندیقەکەی

سەیید ساڵەح هەر بەوەندەوە ڕانەوەستا داوا لە خەڵکی بکات وۆقە تف بکەنە نێو چەوانی، بەڵکو بە زەندیقیش ناوی برد!

هەرچی زانایانی ئایینیش هەبوون، زۆرینەیان هەڵوێستی دژیان بەرانبەر سەیید موحسین دەربڕی و، لەو بارەیەشەوە فەتوایان دا و فەتواکانیشیان بۆ چەندین جار چاپ کرایەوە. هەروەک سی دانەشیان کتێبیان دژی نوسی و هەوڵیان دا بەڵگەکانی هەڵوەشێننەوە و وەدرۆی بخەنەوە. بەندە گشت ئەو فەتوا و کتێبانەم لە کتێبخانەکەی خۆمدا پاراستووە و ماوە نا ماوەیەکیش چاویان پێدا دەخشێنمەوە چونکە وا دەزانم چەشنی تاقیگەیەکن و سودیان لێ وەردەگیرێت بۆ تێگەیشتن لە سروشتی مرۆڤ و مێژووی مرۆیی.

ئێمە کاتێک بزووتنەوە چاکسازیی و نوێخوازییەکان دەخوێنینەوە کە لە مێژوودا سەریان هەڵداوە، دەبینین گشتیان لەسەر یەک

ڕێورەچە ڕۆیشـــتوون. هەروەک پێشـــتریش ئاماژەم پێدا، زۆرینەی خەڵکی بەرتەکی دەدەنەوە مەگەر کەمینەیەک کە قورئـان لە چەنـد ئایەتێک کە ژمارەیان کەم نین، ئاماژەی پێ داوە. ئەوەش ڕیســـایەکی مرۆییە و گشـــت کۆمەڵگە مرۆییەکان لەخۆیدا جێ دەکاتەوە؛ هێندە هەیە ڕێژەی بەرتەکدانەوەکان لە نەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیەکی دیکە دەگۆڕێت. ئەوەش بڵێین تـا کۆمەڵگەکە داخراوتر و دوورەوخراوەتر بێت، ڕێژەی بەرتەکدانەوەکەی زۆرتر دەبێت.

پیاوێک کە هاوڕێی یەکێک لە زانا گەورەکانی ئەم سەردەمەیە بۆی گێڕامەوە کە ئەو زانایە بێدەنگی لەئاســـت بانگەوازەکەی ســـەیید موحســـیندا هەڵبژاردبوو؛ نە پشـتی گرتبوو، نە پشـتیشـی تێ کردبوو. ئەدی ڕۆژێکیان یەکێک لە مەجلیسـێکی خۆیانەدا پرسـیاری ئەو بابەتە و ڕای ڕاســـتەقینەی خۆیی لێ کردبوو، زاناکەش بە چەپ و ڕاســـتدا ئاوڕێکی دابوویەوە تا دڵنیا بێتەوە بزانێت کەسێکی جێمەترسـیی تێدا نییە؛ ئەوسـا وتبووی ئەمانەی لە پرسـەکاندا دەکرێن گشـتیان گەمەی منداڵانن.

ڕای ئەم زانا ئاینییە، لە ڕاستییدا ڕای زۆرێکی هاوشێوەی خۆیەتی، بەڵام لە ترســـی ڕەشـــەخەڵک ناوێرن ئاشـکرای بکەن. ئەوان نان و پێگەیان لە دەســـتی ڕەشـــەخەڵکەوە پێ دەگات و پێشـــبڕکێیانە کامیان زیاترینی ڕەشەخەڵک کەمەندکێش بکەن! ناوێرن ڕای خۆیان بەئاشکرا لەبارەی شـــتێکەوە بڵێن نەکا لێی دوور بکەونەوە و بچن لە دەوری ڕکابەرەکەی خڕ ببنەوە.

زانای ئاینییش وەک گشـــت مرۆڤان مرۆڤە؛ خۆ ئەگەر ئێمەش لە جێ و ڕێی ئەودا باین، هەر وەک ئەومان دەکرد!

## هۆکاره نەستییەکان

لەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی کە خۆم تێیدا گەشـە و نەشـەم کردووە، ڕۆژ لە پاشـی ڕۆژ دەرکی ئەوەم کردووە تقووسـە حوسـەینییەکان ڕوویان لە زیادبوون کردووە؛ ئیدی چ لە ڕووی ژمارە و چش لە ڕووی جۆرەوە. ئەم بابەتەش دوای ئەوەی کەمێک عەقڵم گرت، تووشـی سەرخورانی کردم. تا تەمەنیشم بەرەو بان هەڵدەکشا، زیاتر تووشـی پرسـیاری کردووم تا کار گەیشـتە شـوێنێک بێم و کتێبێکی لەبارەوە بنووسم. ئەوەش ئەو کتێبەیە کە نازانم کەی دەتوانم بیخەمە بەردەستی خەڵکی!

لێرە بواری درێژەدان بەم بابەتە نییە؛ هێندە بەسـە بەکورتی هۆکارە دەروونی و کۆمەڵایەتییە شـاراوەکانی پشـت ئەم تقووس و سرووتانە بکەم کە بوونەتە مایەی دنەدان و گەشەسەندنیان!

بەر لە هەمووشتێک دەبێت ئەوەمان بیر نەچێت کە مرۆڤ ئاژەڵێکی ئاوەزمەند نییە وەک ئەوەی فەیلەسـوفانی کەونارا خەیاڵیان کردبوو. بەڵکوو لە بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتەکانییدا لەژێر کاریگەریی هۆکارە نەستییەکاندایە بە شـێوەیەک کە کەمینەیەک نەبێت دەرکی ناکەن! یان لە هەندێک سـات و کاتدا هیچی لێ نازانێت و کێشـەکەش لەوێدایە کە وا دەزانێت زاتێکی ئازادە و لە بیرکردنەوە و هەڵسـوکەوتەکانییدا هیچ کاریگەرییەکی لەسـەر نییە وەک ئەوەی لۆژیک و دەروونی ئاگا پێمان دەڵێن!

ئەو دەمەی دێین و لە تقووس و پرسـەگێڕانە حوسـەینییەکان دەکۆڵینەوە، ئاشـکرا ئەو شـتەی تێدا دەبینین. ئەویش چەشـنی گشـت گشـت نەریت و دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە وایە؛ بەرهەمی هۆکارە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانە کە مرۆڤ هیچ دەسـتەڵاتێکی تێیاندا نییە. هەر کۆمەڵێک لەژێر کاریگەریی هەمان هۆکاردا بێت، بێ‌شـک هەمان

دەرەنجامیش بەدەستەوە دەدات. ئەوجا لێرە هەندێک لەو هۆکارانە شرۆڤە بکەین:

یەکەم: گرنگترین هۆکار لەم بارەیەوە ئەوەیە کە ناومان ناوە (خەواندنی کۆمەڵایەتی)؛ ئەمە بۆ شرۆڤەی سرووتە حوسەینییەکان ڕاستە وەک چۆن بۆ شرۆڤەی دیاردە کۆمەڵایەتییە هاوچەشنەکانیشی ڕاستە.

مرۆڤ کە هەر لە مێرمدناڵییەوە لەسەر کۆمەڵێک خوونەریت گەورە و گۆش دەبێت، چیدی لە جیهاندا هیچ شتێک لەمانە بە باشتر نابینێت و نازانێت. هەموو لایەنە گەشەکانی زەق دەکاتەوە و لایەنە خراپەکانیشی دادەمرکێنێتەوە و بیری خۆی دەباتەوە ولێرەڕا عەقڵی ئاگا دەربارەیان دەستەوسان دەبێت و لە گەورەییشدا ئەگەر لەناو هەمان قاڵبی کۆمەڵایەتییدا بمێنێتەوە، بێ شک ئەو خەواندنە کۆمەڵایەتییە بەسەریدا زاڵ دەبێت. خۆ ئەگەریش بەحاڵ لەو ژینگەیە ترازا، کەم تا زۆر لەو خەواندنەش ڕزگاری دەبێت.

دووەم: هۆکاری ڕوواڵەتی و خانەدانی کە کاریگەرییەکی دیار و بەرچاوی لە سرووت حوسەینییەکاندا بە شێوەیەکی تایبەت هەیە. کەسی دیار و خانەدان لە کۆمەڵگەدا بە پێویست و ئەرکی خانەدانیی خۆی دەزانێت کە کۆڕی تەعزێباری لە خانە و کاشانەی خۆیدا بگێڕێت؛ یان قەرەباڵغی وەگەڕ بخات یان پارەی زۆر و زەوەند سەرف بکات کە ئەمانەش پێگەی لەناو خەڵکیدا بەرزتر دەکەنەوە.

سێیەم: هۆکاری خۆخاڵیکردنەوە: زۆرێک لە بەشداربووەکانی شین و پرسەی حوسەینی ئەوانەن کە لە ڕۆژانی ئاساییدا هەست بە پێگەی نزمی کۆمەڵایەتیی خۆیان دەکەن و ناویان لێ نراوە (لە پێگە بێبەش)؛ ئیدی لەم ڕۆژانەدا هەوڵ دەدات خۆی بەرز بکاتەوە. بۆیە دەیانبینین لە پێشی ڕیزەکانەوە ڕێ دەکەن یان دەگرین یان بەشداری لە دەهۆڵ کوتیندا دەکەن؛ یان هەر کارێک دەکەن کە ببێتە هۆی

ڕاکێشـــانی ســـەرنج یان کەش و فش بەتایبەت ئەو کاتانەی مێینە تەماشـای دەکەن، ئیدی فووی تێ دەبێت. بۆخۆی لەو کاتەدا خۆی لێ دەبێت بەپیاوێکی ڕاقی کە گاڵتەی پێ ناکرێت.

چوارەم: هۆکاری شـــەفاعەت: ئەمە ئەو هۆکارەیە کە لە بەشـــی پێشـــتردا باســـمان کرد. بەشـــدارانی کۆڕ و تەعزێبارییەکانی ئیمام حوسێن وا دەزانن فاتیمەی زەهرا بەدیاریانەوە وەستاوە و سوپاس و دەسـخۆشـی شـین و گرینەکەیان لێ دەکات کە بۆ حوسـێنی کوری دەیڕێژن و سـەد لە سـەد لە ڕۆژی پەسـڵان تکاکاریان دەبێت. ئەوە بێجگە ئەوەی دواتر پێغەمبەری خودا کە دەکاتە باپیری ئیمام حوسێن، خۆشـی شـەفاعەتیان بۆ دەکات کە حوسـێنی هەر فرە خۆش گەرەک بوو.

پێنجەم: هۆکـاری نەزر: ئەم هۆکـارەش لە ڕووی نـاوەڕۆکە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکەیەوە لە هۆکـاری شـــەفـاعەت دەچێت. خەڵکەکە لەسەر ئەوە ڕاهاتوون بچنە لای کەسانی پیرۆز بە خەلاتەوە اتێک لای خودا شـــەفاعەتیان بۆ کردن تا کارێکی دنیاییان بۆ فەراهەم بێنێت. ئەمەشـیان ناو ناوە (نەزر). ڕاسـتییەکەشـی ئەوەیە خەڵک شـت نەزری حوسێن دەکەن و سفرە و خوان بە بۆنەی ئەوەوە دەڕازێننەوە یان پرسـەی بۆ دەگێڕن یان هەر شـتێکی دیکەی بۆ دەکەن. شـکیشـی تێدا نییە هەندێکیان داخوازییەکانیان بۆ بەجێ دەهێنرێت و ئەویش ناچارە بەرانبەر نەزرەکەی ئەمەکدار بێت.

ئێمە نابێت لۆمەی خەڵکی بکەین کە چی لە خۆیان دەکەن بەپێی ئەو بڕوا و ئیمانەی لەسەری گەورە و گۆش کراون. ئەوان لەم کارەدا هیچ ویسـت و ئیرادەیەکیان نییە (وەک پێشـتریش باسـمان کرد). خۆ ئەگەر ئێمەش لەو ژینگەیەی ئەوانـدا گەورە بـاین، وەک ئەوان دەردەچووین!

## ١٢

# هەمدیس گەڕانەوە بۆ سەر مێزی قوتابخانە

**لە پیشەی عەتتارییەوە ڕاستەوخۆ بۆ پۆلی شەشەم**

**لە تشرینی دووەمم (ئۆکتۆبەر)ی ١٩٣٢ بومە ئەفەندی و چوومە ئامادەیی کەرخ و لە ١٩٣٥ بوومە یەکەمی سەر ئاستی عێراق.**

لە بەشەکانی پێشودا باسی ئەو هەڵبەز و دابەزانەی ژیانمم کرد کە وایان لێ کردم ببمە عەتتار و خاوەن دووکانێکی چکۆڵە لە یەکێک لە شەقامەکانی کازمییەدا. لەم بەشەشدا باسی ڕووداوەکانی پاش ئەوە دەکەم کە چی ڕوویدا و چۆن وازم لە پیشەی عەتتاری هێنا و جارێکی دیکە گەڕامەوە سەر مێزی قوتابخانە!

لە هاوینی ١٩٣١، کاتێک لە دووکانی عەتتارییەکەم دانیشتبووم، یەکێک لە دۆستانی قوتابخانەی سەرەتاییم هاتنە سەردانم و ڕایگەیاند وا خەریکە قوتابخانەی سەرەتایی ئێواران لە کازمییە دەکرێتەوە؛ زۆریشی هەڵنام تا لێی بخوێنم. ئەو قسانە هەروا سەرزارەکی لەوەوە کران، بەبێ ئەوەی بزانێ چ گۆڕانکارییەکی گەوهەری لە سووری ژیانمدا دەئافرێنێت. تەنانەت خۆشم نەمدەزانی کار بە کوێ دەگات!

چوومە سەردانی بەڕێوەبەرایەتیی خوێدنگەی ئێواران تا ناوی خۆم تۆمار بکەم. بەڕێوەبەرەکە دەیناسیم چونکە خۆی لە سەرەتاییدا

مامۆستامان بوو. بەخێری هێنام، بەڵام وتیشی بەداخەوە پۆلی پێنج لەبەر کەمی ڕێژەی ناونوسین ناکرێتەوە. ئیدی منیش لە بڕیاری گەڕانەوە بۆ خوێندنگە پەشیمان بوومەوە، کەچی لێرەدا هەمدیس قەدەر دەستی وەردایەوە ژیانم؛ ئەویش: بەڕێوەبەر بڕیاری دابوو بمخاتە پۆلی شەشەمەوە و وتبوویشی: خۆم بەرپرسیاریتیی لێکەوتەکانی لەئەستۆ دەگرم! ئەو چاکەیەی مەگەر بمرم بیرم بچێتەوە.

لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی دەوامم کرد و لێی دەرچووم و بڕوانامەیم وەرگرت کە دەمتوانی بچمە خوێندنگەی ناوەندی. ئا لەو کاتەدا بڕیارم دا دووکانەکەم بفرۆشم و خۆم بۆ خوێندن یەکلا بکەمەوە. ئەو بڕەشی لە دووکانەکە پەیدام کردبوو، یارمەتی دام ماوەیەکی نەچەندان کورت لە ڕێی خوێندنەکەمدا سەرفی بکەم.

لەو دەمانەدا خوێندنگەی ناوەندی لە کازمییە نەبوو، ناچار ملی ڕێی کەرخم گرت. گشت ڕۆژێک بە تراموای کە ئەسپ کێشیان دەکرد، دەچوومە خوێندنگە. ڕاستییەکەی ئەو ماوەیە زۆر دڵخۆش بووم، دەتگوت تازە لەدایک بوومەتەوە!

## گۆڕینی پۆشاکەکانم

مانگی ئۆکتۆبەر (دە)ی ساڵی ١٩٣٢، مانگێکی فرە گرنگ بوو لە ژیانمدا. ئەو مانگەیە کە تێیدا چوومە ناوەندیی کەرخ- وەک پێشتر باسم کرد. ئەوەش ناچاری کردم پۆشاکە کلتورییەکانم بە پۆشاکی هاوچەرخ بگۆڕم؛ واتە بوومە (ئەفەندی)، وەک ئەوەی لەناو مەردوومدا باو بوو.

جاران پۆشاکی دزداشە و عەبا و ڕۆب و عەمامەیەکی سەوزیش وەک نیشاندەری ئەوەی لە ئەولادی ڕەسولم و سەییدم لەبەر دەکرد.

شایەنی باسیشە، عەمامەکان سێ ڕەنگ بوون؛ ڕەش، سپی و سەوز. ڕەش تایبەت بوو بە زانای ئایینییەوە ئەگەر سەییدیش بووایە؛ سپی تایبەت بوو بە زانای ئایینییەوە و کە سەیید نەبووایە. سەوزیش بە کەسانی چەشنی من کە سەیید بوون، بەڵام خوویان دەبوویە کار و پیشەی جیاواز جیاواز.

زۆر سەخت بوو عەمامە سەوزەکەم لادەم و کڵاوی ئەفەندییان لەسەر نێم- ئەوەی پێیان دەگوت فەیسەڵی -کە هەر دەشبوو بیکەم. لای خەڵکی مانای ئەوەبوو من گۆڕاوم و چوومەتە سەر عەقیدەی نوێ، عەقیدەی ئەوانەی بڕوایان وایە زەوی گۆییە و بارانیش لە هەڵمەوەیە.

لە سەرەتادا نەمدەتوانی بەیەکجار خۆم بەو پۆشاکانەوە نیشانی خەڵکی بدەم. هەوڵیشم دەدا پێدزکێ و بەبێ خشپە لە کوچە و کۆڵانە باریک و چەپەکەکانەوە بگەمە وێستگەی تراموای. خوا کردی و ڕۆژێک یەکێک لە پیرە ناسراوەکانمان بینیمی و هاواری کرد (دینەکەیان بە دینار فرۆشت!).

لاوێکم دەناسی کە ناچار بوو ئەویش لەبەر خوێندن پۆشاکەکانی بگۆڕێت، بەڵام لە من زیاتر لە خەڵک خۆی دەپاراست چونکە باوکی پیاوی ئایینی بوو. بیرمە دەچوو پۆشاکە نوێیەکانی لە دووکانێکی نزیک خوێندنگە دادەنا و بە پۆشاکە خۆجێیەکانەوە دەکەوتە ڕێ و لەوێ خۆی دەگۆڕی و دەچوویە خوێندنگە. خوداش پۆشەری گشت شتێکە!

### کێشەی ئێرەیی بردن

لە خوێندنی ناوەندیشدا هەر چەشنی سەرەتایی لە پلەی بەرزدا بووم؛ یەکەمی پۆل بووم. لە هاوینی ١٩٣٥ کاتێک ئەنجامی

تاقیکردنەوەکانی ناوەندی ڕاگەیەندرا، هەمدیس بوومەوە بە یەکەمی سەر ئاستی عێراق.

لە سروشتی یەکەمبوون و سەرتربوون لە خوێندن و هەر بووارێکی دیکەدا، پاش ماوەیەک نزیکان و دوواکەوتووان دەست دەکەن بە ئێرەیی بردن. ئێرەیی بردن سروشتی بنیادەمە و ناتونێت تەواو خۆی لێ داتەکێنێت؛ هێندە هەیە ڕێژەی بەهێزی و لاوازییەکەی لە یەکێک بۆ یەکێکی دیکە بەپێی هۆکارە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان دەگۆڕێت.

ڕاستییەکەشی ئەوەیە، من بەدەست ئێرەیی هەندێک لە نزیکانەوە لە خوێندنی سەرەتاییدا تلابوومەوە؛ ڕقیان بۆم کۆ دەکردەوە و بە هەر ئامرازێک دەستیان بکەوتایە، هەوڵیان دەدا ئازارم بدەن. بەلام لە خوێندنی ناوەندیمدا کەمتر ئازارم لەلایەن حەسوودانەوە پێ دەگەیشت کە دەتوانین بۆ ئەم دوو هۆکارەشی بگەڕێنینەوە:

دیارە خوێندکارانی سەرەتایی لە ناوەندی بچوکترن؛ ئاشکراشە ئێرەیی لە منداڵان زیاتر ڕوونە وەک لە گەورانـدا. گەورە دەتوانێت ئێرەییەکەی بشارێتەوە تا کاتی گونجاوی خۆی دەگات یان لە شتێکدا دەری ببڕێت کە کۆمەڵگە لۆمەی نەکەن لەسەری. بەلام بچووک توانای بەرزەفتکردنی هەست و سۆزەکانی نییە و ئێرەیی خۆی بەبێ پاساو و پینەوپەڕۆ دەبات و دەکات.

ژمارەی خوێندکارانی ناوەندیی کەرخ چەند بەرانبەری قوتابخانە سەرەتاییەکە دەبوو کە لێم خوێندبوو؛ خوێندکارەکانیش لەمپەڕ و ئەوپەڕەوە هاتبوون. لە سروشتی ئێرەییش وەهایە، زیاتر لەنێوان ئەوانەدایە کە لە یەک ناوچەی داخراودا پێکەوە گەورە بوون. هەر تاکێک تووشی ئازار دەبێتەوە کاتێک دەبینێت هاوگەڕەک و نزیکەکەی خۆی وا خەریکە بەسەریدا سەردەکەوێت و پێشی دەداتەوە؛ یان پێگەیەکی دەست کەوتووە و ئەمیش چاوی لێیەتی. هەتا کۆمەڵگەکە

هەمەڕەنگ و بەربڵاوتر بێت، ڕێژەی ئیرەییش کەمتر و لاوازتر دەبێت. هەر ئەمەشـە بۆیە ئیرەیی لە کۆمەڵگە سـەرەتاییەکان و خێڵەکییەکاندا لە کۆمەڵگە پێشکەوتوو و شارستانییەکاندا زیاترە.

## ئیبن جاویید

سـەرکەوتن و پێشـوەچوونم لە نـاوەنـدیی کەرخ وای لە بەڕێوەبەرەکەمان کرد لە سـاڵی ١٩٣٥ داواکارییەک پێشـکەشـی وەزارەتی مەعاریف کە ئێسـتا پێی دەڵێین پەروەرد بکات کە بخرێمە ڕیزی ئەو خوێنـدکـارانەی یـارمەتیی دارایی دەدرێن. یـارمەتییەکەش لەوسـادا خۆی لە دینار و نیوێک توند دەکرد. ئەو بڕەش بۆ کوڕە هەژارێکی وەک من هەر زۆر زۆر بوو. بە مـانـایەکی دیکە دەیکردە چوار ئەوەندەی مانگانەی چەند ساڵێک لەوەوبەر کە خەریکی عەتتاری بووم لە گەڕەکی ئەنبارییەکان.

ئەم نیعمەتە زۆری نەخایاند. پاشـی سـاڵێک وەزارەت بڕییاندا بیبڕن. ئەوەی جێگەی سـەرنجە، بڕینی پاداشـتەکەم زۆر دوای ئەوە نەبوو کە لە ناوەندییدا ببومە یەکەمی سەر ئاستی عێراق (وەک پێشتر باسم کرد بۆتان).

خوێنەر زۆر زەحمەت بڕوا بەمە دەکات، بەڵام بەڕاسـتی وابوو. ئەوەشـی بیهەوێ لە پەروەندەکانی وەزارەتدا بەشـوێنیدا بگەڕێت، دەتوانێ پەیدای بکات.

هۆی ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ یەکێک لە فەرمـانبەرە گەورەکـانی دەوڵەت لە وەزارەت کە بە لایەنگیریی بۆ ڕۆڵەکانی ناوچە و شـاری خۆی ناوی دەرکردبوو؛ یان کەسـێک واسـیتە و کەسـدار بووایە و هەقی بەوانی دیکەوە نەبوو. دیارە فەرمانبەری وا لەو ڕۆژگارەدا نامۆ

و دەگمەن نەبوو؛ فرە و فراوان لە وێنەی ئەم هەبوون. ئێستاشی بەدەمەوە بێت، هەندێکیان هەر ماون!

ئەو فەرمانبەرە گەورەیە دەیویست بەخششەکان بۆ ڕۆڵەی شارەکەی خۆی بماشێتەوە. بۆخۆی دەهات و بەناو ئەو خوێندکارانەدا دەگەڕا کە لە وەزارەتەوە پارمەتی دەدران و بۆ بیانوویەک دەگەڕا تا مووچەکەیان لێ ببڕێت ئەگەرچی بیانووەکەشی زۆر بێمانا و پووچ بووایە. لە کۆتاییدا توانی بیانوویەک لە نوسەری ئەم دێڕانە بگرێت و بیکاتە هۆی بڕینی پارەکەی (جەخار!)

ڕۆژێکیان لە یەکێک لە پۆلەکانی ئامادەییدا فێرخوازانی یەکێک لە پۆلەکان هەستان بە بایکۆتی تاقیکردنەوەی مامۆستای وانەی ئینگلیزی. لە بەختی ڕەشم، منیش یەکێک بووم لە فێرخوازانی ئەو پۆلە؛ پێم خۆش نەبوو لەو بایکۆتەدا خۆمیان لێ جیا بکەمەوە. ئیدی مامۆستاش یەکی سفرێکی خشتی دا بە هەمووان و منیش لەو سفرەم بەر کەوت. ئیدی ئەو فەرمانبەرە گەورەیەی کە باسمان کرد، بانگی کردم بۆ فەرمانگەکەی خۆی و پێی ڕاگەیاندم کە وەزارەت بڕیاریان داوە -مادەم ئەو نمرە ئابڕووبەرەت هێناوە- هاوکارییەکەت لێ ببڕن.

تکای منیش لێی ئەوەبوو، ڕاوەستێت تا دەگەینە کۆتایی ساڵ و تاقیکردنەوەکانی دەکەین، نەک ئەوەی لەسەر تاقیکردنەوەی مانگانە بڕیار بدات؛ کەچی تکاکەی دایەوە بە تەنگەمدا و لە فەرمانگەکەش وەدەری نام. ئیدی هاوکارییەکەشی دایە خوێندکاری جێمەبەستی خۆی. دواتریش زانیم ئەو خوێندکارە یەکێکە لەئەندامی خانەوادە دیارەکان. هێشتاش زیندووە و ماوە ماوە دەیبیم و بە بۆنەی ئەوەوە دەکەومەوە یادی ڕۆژانی ڕابردوو!

لۆمەی ئەو فەرمانبەرە گەورەیە لەسەر ئەو ئەتوارەی ناکرێت. ئەو لە ژینگەیەکدا گەورە بووە کە دەبێت یارمەتی هاوگەڕەک و هاوشارییەکانی بکات؛ یان بەو نەریتە خێڵەکییەی کە خوویان پێوە

گرتووه شەفاعەت بۆ ئەو کەسانە بکات کە پێویستیان پێیەتی. ئەو لە شەستەکاندا وەفاتی کرد. لەپاش مەرگی، چووم و پرسیارم لەبارەیەوە کرد، وەسف و سەنا و ستایشی زۆریان دەکرد و بە (نەجیب) و (ئیبن جاوید) و (شاپیاو) ناویان دەهێنا و شتانی دیکەش کە لەناو خەڵکیدا باوە و دەگوترێن.

بۆ من و بەگوێرەی من کابرایەکی ستەمکار و بێفەر بوو، کەچی لە چاوی سوودلێوەرگرتووەکانیدا دادپەروەر و بەخشندە بوو. ئەوەش وێنەی سروشتی مرۆڤمان لە گشت سات و کاتێکدا بۆ دەنەخشێنێت. دەشێ ستەم دادپەروەری بێت بۆ هەندێکی دیکە.

# بەشی دووەم

## گفتوگۆکان لەگەڵ گۆڤاری (التضامن)

**عەرەب لە کارلێکی شـــارســـتانی و دەوارنشـــینیدا لێـــک دەچن و، تـــا دەوڵەتیـــان تێـــدا لاواز بێـــت، شارستانییەتیش تێیاندا لە کزی دەدات.**

(التضامن ٤/ ٥/ ١٩٨٥) ژمارە: ١٠٨

هێندە بەسە ناوی دکتۆر عەلی وەردی لەبەردەم هەر خوێنەرێکی کۆمەڵگەی عێراقییدا بەریت، خێرا چەندین وێنە و دۆخ و هەڵویستی جۆراوجۆری دێنە پێش چاو. ئەم زانا کۆمەڵناسە کە توانی شۆڕشێکی بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتی بەرپا بکات، لە کاتێکدا بیرکردنەوە لە شتی لەو شێوەیە هیچ گرنگی و پێگەیەکی نەبوو. ئەو گرێکانی واقیعی کردەوە و کێشەکانی چارەسەر کرد و شتەکانی بەناوی خۆیانەوە ناو لێنا. جارێکیان مەیلی بەلای ڕەهابوون لە خونەریتە کۆمەڵایەتییەکانە و، جارێکی دیکە شۆڕش بەسەر گشت تایبەتمەندییەکانی عەقڵدا دەکات و، جاری دواتر یادگەیەکە بۆ یادداشتکردنی قۆناغەکانی مێژووی کۆمەڵایەتی. ئیدی دەست بە شیکردنەوە و دەرخستن و ڕەخنەگرتن دەکات. وا ئەمڕۆش لێرە دکتۆرمان لەگەڵە؛ دکتۆر عەلی وەردی کە لە قۆناغی ڕابردوودا دەنگێک بووە لە دەنگەکانی ویژدان.

بەرهەمەکانی زیاتر تایبەتن بە کۆڵینەوە لە کۆمەڵگەی عێراقی و عەرەبی و ئەوانەش زۆرترینی کتێبە بەناوبانگەکانی پێک دێنن. هەندێکیشیان بۆسەر زمانە بیانییەکانی وەک ئینگلیزی و ئەڵمانی و ئیسپانی وەرگێڕدراون.

دوکتۆر وەردی ئێستا لە ٧٢هەمینساڵی تەمەنیدایە؛ وێڕای ئەو تەمەنەش هێشتا زیندوویەتی و چالاکی و خوێندنەوە و بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە لە دیاردە و هەڵویست و دۆخەکاندا لە شادەمارەکانیدا دەرک دەکرێن.

ئەو دەمەی سەردانی ماڵەکەیمان کرد – کە دەکەوێتە ناوچەیەکی ئارامی بەغدای کۆنەوە- کۆمەڵێک کتێبمان بینی کە زۆربەیان پەیوەندییان بە بابەتی دەروونناسی و کۆمەڵناسییەوە هەبوو کە ئابلۆقەی مێزی نوسینەکەیان دابوو. کۆمەڵێک کاغەزیش کە دەخرانە نێو کیسێکی کاغەزیی بچووکەوە کە خۆیان لە بەش و دەلاقەی کتێبەکان یان تێبینیدا دەبینییەوە.

بەردەوام پرسیاری بۆ ئەو کەسانە پێ بوو کە پێی دەگەیشتن. دەستپێشخەری لە پرس و جۆر و زانیندا دەکرد. ئەم کابرایە کە لەدایک بووە، پرسیار لەسەر زاری بووە: پرسیاری ناسین و خۆشەویستیی بۆ زانین. بەڵام ئەو پرسیارەی خوتخوتە دەخاتە دڵەوە کاتێک ڕووبەڕووی دکتۆر وەردیی حەفتا و دوو ساڵ دەبێتەوە ئەوەیە: ئایا لەم تەمەنەدا هەست بە چی دەکات؟ سۆزەکانی؟ چ ئاوات و حەزێکی لە گشت ئاوات و حەزەکان زیاتر تێدا زەق بووەتەوە؟

من دەمپرسی و ئەویش وەڵامی دەدامەوە:

لە لایەکەوە هەست بە جۆرێک لە ترس و بیم دەکەم و لە لایەکی دیکەشەوە بە جۆرێک لە تەسەوف. باوباپیرانمان کە ڕادەگەیشتنە ئەم تەمەنە، پەنایان بۆ پەرستش دەهێنا و تاریفی خودایان دەکرد و نزا و قورئانیان دەخوێند. ئەوان دڵنیا بوون کە لە بەهەشتی فیردەوس قەسر و باڵەخانەیان بۆ بنیات دەنرێت و حۆریی چاو گەورە بەدیاریانەوە وەستاون. ئا لەم کاتەدا بۆ ئەوەی بچنە نێو تەلار و قەسرە هەورینەکانیانەوە، ئاواتیان بە مردن دەخواست.

من: ئایا ئەمڕۆ تۆش هەمان هەستت هەیە؟ یان هەست بەوە دەکەیت کە ئەوان کردوویانە؟

دوکتۆر: بەداخەوە دەبێت بڵێم: شارستانییەتی هاوچەرخ ئەو دڵنیاییە دەروونییەی جارانی کەم کردووەتەوە. ئەو شارستانییەتەی لە دیوی مادییەوە سوودی چاکی بە مرۆڤایەتی گەیاندووە و زیانی لە دیوە مەعنەوییەکەوە تێ بەر داوە. لە ئەوروپا کەسانی هاوتەمەنی خۆمم دەبینی کە خەریکی زەمکردن و داشۆرینی شارستانییەت بوون و باسی ئەو بڕوا یەکلاکەرەوە و دڵئارامییەیان دەکرد کە باوباپیرانیان هەیانبووە.

پرسیارکەر: ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە: وتووتانە مەیلم بەلای تەسەووفدا دەچێت! چما کام تەسەووفەیە کە مەیلی ئێوەی ڕاکێشاوە؟ ئایا دەشێت ناوی قەرەبووی ئەو عەقیدە تەقلیدییەی لێ بنرێت کە پێشتر لەدەستتان چووە؟

دوکتۆر وەردی: ئەو تەسەووفەی من مەیلم بۆی هەیە، تەسەوفێکی فەلسەفییە و لەسەر "ئیمان بە خودا و پیرۆز نەکردنی هیچ کەسێک" لە بەندەکانی بنیات نراوە. بڕوام وایە ئەم گەردوونە بەرینە سەرسوڕهێنە هەر دەبێت وەدیهێنەر و پێکهێنەرێکی هەبێت. ئیدی چۆنییەتی پێکهێنەرەکە خۆی و مەبەست و ویستی لە دروستکردنی جیهاندا، ئەوانە گشتیان کۆمەڵێک پرسیارن کە ناکرێ وەڵامیان بدرێتەوە، چونکە عەقڵی مرۆیی لەم بوارەدا کورت دەهێنێت و هێندەی بەسە بڕوا بە پێکهێنەرەکە بکات بەبێ ئەوەی بچێتە وردەکاری و تان و پۆی بابەتەکە. ئا لێرەدایە ڕاستیی قسەکەی جونەیدی بەغدادی، سۆفیی بەناوبانگی لە بەغدا نێژراو دەردەکەوێت کە دەڵێت: (بیر لە نیعمەتەکانی پەروەردگار بکەنەوە و بیر لە خودی خودا مەکەنەوە).

پێشم خۆشە بڵێم: هەموو ڕۆژێک نوێژ بۆ خودا دەکەم، بەڵام بە ڕێگەی تایبەتی خۆم.

پرسیارکەر: ڕێگەی تایبەتی خۆت؟

دوکتۆر وەردی: بەڵێ! ساڵانێکە ڕاهاتووم هەموو ڕۆژێک بچمە نێو هەوای خاوێنەوە و ماوەی کاتژمێرێکم پێ بچێت و ئەو دەمەشی دێم و دەچم، لەگەڵ هەموو هەناسەوەرگرتن و دانەوەیەکدا یادی ناوی خودا بکەم. هەست دەکەم ناوی خودا بەناو گشت خانە و گەردیلۆکەیەکی لەشمدا هامۆشۆ دەکات. من مەیلم بەلای ئەو نوێژە

باوەدا ناچێت و بڕوام وایە ئەم نوێژە تایبەتەی خۆم زیاترم لە خودا نزیک دەکاتەوە وەک لەو نوێژەی دیکە.[8]

پرسیارکەر: ڕێگەم بدە لەم کەشە بچینە دەرەوە و سەرێک لەو لایەنە بدەین کە من بۆی هاتووم و گەرەکمە لەبارەیەوە بپرسم؛ ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە لە نوسینەکانی سەردەمی پاشایەتییتدا جیاوازیت لەچاو پاش نەمانی سەردەمی پاشایەتییدا چ لە ڕووی شێوەنوسین و چش لە ڕووی نەریتی بیرکردنەوەوە. چما لەو بارەیەوە هۆیەکی ئاشکرا و ڕوون بوونی هەیە؟

دکتۆر وەردی: نکوڵی لە گۆڕانی نەریتی نوسین و بیرکردنەوەم ناکەم لەپاش شۆڕشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨. هۆی پشت ئەوەش: بەر لە شۆڕش من دڵم بەلای گەل و نەیاری دەسەڵات بووم. ئازاری هەژاری و پیشەوەری کە لە سەرەتای ژیانمەوە پێوەی تلاومەتەوە، وایان لێ کردبووم بەلای هەژار و دەستەوساناندا با بدەمەوە کە خۆشم لە بەرایی تەمەنمەوە پێوەیان هەڵوگیر ببووم و هەژاریی و نەداریی ئەوان بخەمە ئەستۆی دەسەڵاتدارانەوە. هەر بۆیەشە نەریتی سەردەمی پاشایەتیم لە گەرمی و توندی بێبەش نییە. ئەوەش مانای ئەوەتانێ کەم تا زۆر لە بابەتییبوون دوور بووم. بەڵام کە لە ١٩٥٨ و ١٩٥٩دا کردەوە غەوغاییەکانم چاو پێکەوت، تێگەیشتم جاری واش

---

[8] - هەموو لادانێکی کاتی بەچێژترە، بەڵام مەرج نییە تاسەر وا بەچێژ و لەزەت بمێنێتەوە. دەروونی مرۆڤیش بە سروشت حەزی لە لادانە. گەر مرۆڤ بەراست بەندەی خودا بێت، لانی کەم ئەو نوێژە دەکات کە ئایینەکەی فەرمانی پێ کردووە؛ ئیدی دواتر چ جۆرە نوێژێکی دیکەشی حەز لێبوو، دەتوانێت بیکات و هیچ بەربەستێکی نییە. ئەمە وەک ئەوە وایە خاوەنکار پێت بڵێ کاتژمێر سێ تا چوار لێرە کار بکە؛ تۆش اتژمێر حەوت تا هەشت بچیتە ئەوێ! خولاسە: زۆرێک لەم جۆرە بیرکردنەوانە لە ئەنجامی تەمبەڵی و تاقەت نەبوون بۆ هەستانی نوێژی بەیانی و عیشا و کاتەکانی دیکەوە سەر هەڵدەدەن و دواتر بەرگێکی فەلسەفییان بەبەردا دەکرێت گوایە ئەمە بە بیرکردنەوە پێی گەیشتوون! وەرگێڕ

هەیە گەل دەبێتە ستەمگەر. هەروەتر جوانتر لەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خودا گەیشتم کە دەفەرموێت: (خۆتان چۆن بن، واتان بەسەرەوە دەبێتە دەسەلاتدار).

پرسیارکەر: واتە گۆڕاویت؟

دوکتۆر: من لەپاش ١٤ی تەمووز زۆر زۆر گۆڕام. تەنانەت ماوەی پێنج ساڵ توخنی نوسین و دانان نەکەوتمەوە، بێجگە لە یەک کتێب کە لە قاهیرە بۆم لەچاپ درا بەناونیشانی (لۆژیکی ئیبن خەلدوون لەژێر ڕۆشنایی شارستانییەت و کەسایەتییدا) لە ساڵی ١٩٦٢.

پەرسا: ئێستاش وا چەن ساڵێکە هیچ کتێبێکی نوێت نابینین...

دوکتۆر: هۆی دەستبەرداریی ئێستام پیرییە نەک شتی دیکە. ئێستاشی بەدەمەوە بێت، شتانێک هەر دەنوسم، بەلام ئەو هێز و پێزەی جاری جارانم نەماوە. وای چەندە جیاوازی لەنێوان گەنجی وپیرییدا هەیە. دەمی ئەو شاعیرە گەرم کە وتوویەتی:

خۆزێ یەک ڕۆژ لاوی دەگەڕایەوە

تا هەواڵم بدایەتێ پیری چم لێ دەکا

پەرسا: لە دەورانی چوستی و چالاکییتدا سێ گریمانەت بۆ کۆمەڵگەی عێراقی بەتایبەت و کۆمەڵگەی عەرەبی بەگشتی بەر باس خستبوو؛ دەکرێ شتێکم لەو بارەیەوە بۆ بڵێیت؟ ئایا تا ئێستاکەش لەپاش سێ دەیە هەر لەسەر ئەو بڕوایەت ماوی؟

دوکتۆر: پێم خۆشە ئەوە بڵێم ئەم گریمانانە زادەی بیری خۆم نین؛ بەڵکوو لە هەندێک کۆمەڵناسی گەورەی جیهانییم دەرکێشاون. ئەوەی من تێیاندا ئەنجام داوە، بریتییە لە پەرەپێدان و گەشەپێدانیان تا لەگەڵ واقیعی ئەمڕۆدا بێنەوە.

یەکەمی نـاو ئەو گریمـانـانە بریتییە لە (گریمـانەی کـارلێکی شارستانییەت و بیاباننشینی)، کە ئەمەم بێگومان لە ئیبن خەلدوونەوە وەرگرتووە. ئەو خەلـدوونەی بە یەکەم بیرمەنـدی کۆمەڵنـاس لە پەڕانپەری جیهـانـدا دادەنرێت. زۆر بەجوانی لە سـەحرانشـینی کۆڵیوەتەوە و بەراوردی بەو شارستانییەتە کردووە کە لە سەردەمی خۆیـدا هەبووە. هەروەک چۆن هەوڵی دۆزینەوەی ئەو نـاموس و یاسـایانەی داوە کە دۆخەکە لە کاتی کارلێکیان لەگەڵ شـارسـتانییەتدا هەڵـدەچەرخێن. بە بڕوای من، دەبێـت لە ڕووانگەی بیردۆزەکەی خەلدوونەوە لە کۆمەڵگەکەمان بکۆڵینەوە- بە داخیشـەوە دەبێت ئەوە بێژم زۆربەی لێکۆڵەرەکـانمـان لێی بێخەبەرن. دەبینین دێن و لە کۆمەڵگە عەرەبییەکـانیـان دەکۆڵنەوە لە ڕووانگەی بیردۆزی نـامۆوە، وەک بیردۆزی مارکسی و باسۆنی و بیردۆزگەلی دیکە.

دەشـێ بشـگۆترێ: لە جیهـانـدا هیچ کۆمەڵگەیەکی دیکە نییە هاوشـێوەی کۆمەڵگەی عەرەبی شـارسـتانییەت و سـەحرانشـینی تێیدا کارلێکیان کردبێت. ئێمە ئێسـتەکانێ کە تەماشـای نەخشـەی جیهان دەکەین، دەبینین نیشتمانی عەرەب گەورەترین درێژبوونەوەی بیابانیی تێدایە کە هەر لە کەنداوەوە تاوەکونێ ئۆقیانوس دەگرێتەوە. دیارە لە جیهاندا هیچ پارچە زەوییەکی هاوشـێوە بەم تایبەتمەندییەوە بونی نییە. هەر لەم بارەیەوە بیرمان نەچێت کە نیشـتمانی عەرەبی لانکەی یەکەمین شـارسـتانییەتی جیهانی بووە، هەروەک چۆن لە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا بۆ چەندین سـەدە چەقی شـارسـتانییەتی جیهانی بووە. ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەنجامێک کە بەریەککەوتنی شـارسـتانییەت و

سەحرانشینی لێرە لە هەموو شوێنێکی دیکە زەق و زۆپتر دەبینرێت. هەروەها دەبێت کاریگەرییشی لە پێکهێنانی کەسایەتیی گشتییدا هەبووبێت.

پەرسا: ئایا وای دەبینیت هەموو بەشەکانی ئەم نیشتمانە وەک یەکیان بەرکەوتووە یان هەریەکە بە ئەندازەیەکی تایبەت بە خۆی؟

دوکتۆر: بەشەکانی نیشتمانی عەرەبی لە ڕووی سروشتە گشتییەکەی کارلێکی نێوان شارستانییەت و سەحرانشینییەوە، هەموویان وەک یەکن. بەڵام لە ڕێژەی بەهێزی و بێهێزیی کارلێک و شێوازی کارلێکەکەوە لێک جودان. لێرەدا نوختەیەک هەیە کە دەبێت چەقی سەرنجی بخرێتە سەر، ئەویش: دەوڵەت دەبێتە چەقی شارستانییەت و ناواخنی. ئەگەر دەوڵەت لە شوێنێکدا لاواز بێت، ئەوە شارستانییەتیش لاواز دەبێت. ئیدی لەو ساتەدا دەوارنشینە هاوسێکان دۆخەکە بە هەل دەزانن و بەها و چەمک و نەریتەکانی خۆیانی تێدا بڵاوە پێ دەکەن.

پەرسا: بۆ نموونە؟ بۆ ئەوەی تەواو تێبگەین؟

دوکتۆر: میسر بۆ نموونە. کۆمەڵگەگەلێکی تێیدایە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کاریگەربوون بە دەوارنشینی و خێڵایەتی. لە دیوی باکوورییەوە کە پێی دەگوترێت دیوی دەریایی، بە درێژایی سەدەکانی پێشوو دەوڵەت تێیدا بەرپا و بەهێز بووە؛ دەوڵەتێکی ستەمگەر و داگیرکەر بەڵام هەرچۆنێک بێت بەهێز. مانای ئەوەتانی لێرە شارستانییەت نەڕووخاوە و لەبەین نەچووە وەک ئەوەی لە بەغدا بەدەستی مەغۆلانەوە ڕووخا.

ئەو دەمەی دیوی دەریایی بە کۆمەڵگەی لای وشکانیی میسر بەراورد دەکەین، جیاوازییەکی فرە و فراوانی خوونەریتی هەست پێدەکەین. لای وشکانی نزیکترە لە بەها خێڵەکییەکانی وەک

دەمارگیریی خێڵایەتیی و تۆڵە و ئابڕوو شـــۆردنەوە و ئەو جۆرە بەهایانە. هۆی ئەوەش: کۆمەڵگەی لای وشـکانی دوور بووە لە چەقی دەوڵەتەوە؛ بۆیەکانێ خێڵایەتی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر داناوە.

پەرسا: ئەی دۆخی کۆمەڵگەی عێراقی لەم ڕووەوە چلۆن دەبینیت؟

دوکتۆر عەلی وەردی: کۆمەڵگەی عێراقی نزیکەی شـەش سـەدەی تەواوی تێپەڕانـدووە کە خێڵایەتی ڕۆڵی گەورە و کـاریگەری تێیـدا هەبووە. ئەو ماوەیەش لەنێوان دوو داگیرکارییدا بووە. بە گوزارشـتی مێژوونووســـی عێراقی، عەبـاس عەقراویی ڕەحمەتی، لەنێوان داگیرکاریی مەغۆلی ســـەدەی ســـیانزەهەم و داگیرکاریی بەریتانیای ســـەدەی بیســـتەم، ئەو ماوەیە عێراق هیچ دەوڵەتێکی ڕاســـتەقینەی نەبووە. دەوڵەت هیچی بەلاوە گرنگ نەبووە بێجگە لە وەرگرتنی باج و خەراج و بەرتیـل؛ دواتریش بە کەیفی خۆیـان حەزیـان لە چی بووە کردوویانە. ئیدی شارستانییەت تێک تەپی و ئاسایشیش لەبەین چوو. لەوێش‌ڕا بەها خێڵەکییەکان زۆر خەست پەرەیان ستاند. من بۆ خۆشم پاشماوەی ئەوەم لە دەورانی منداڵیمدا هەست پێ کرد و زۆریشـم لە مەردووم لە بارەیەوە دەبیست...

دوکتۆر درێژە بە قسان دەدات:

لەو ســـەردەمەدا تاک وای لێ هاتبوو، ئەگەر دەســـتێکی بۆ درێژ بکرێت، سـکاڵا و گلەیی خۆی نەباتە لای دەوڵەت، چونکە بردنی گلەیی بۆلای دەوڵەت نیشـــانەی حیزەڵەیی و بوودەڵەیی دەگەیاند. کەســـی مەرد ئەوەیە مافی خۆی بە دەستی خۆی بسەنێتەوە. خۆ ئەگەرەکینەی یەکێـک نزیکی یەکێکی دیکە بکوژێـت، ئەوا دەکوژرێتەوە. هەروەتر دیاردەی شـۆردنەوەی ئابڕوو گاڵەی دەکرد؛ مەبەســـتمان کوشـــتنی ژنێکە لەبەر ئەوەی هینی کردووە؛ هەروەک چۆن دەمـــارگیریی خێڵایەتی زۆر زەق و زۆپ بوو و کوشـــتن و لێکدان لە کوچە و کۆلانەکانی شـــاردا باوو و ئاشـــکرا بوو. هەرکاتێک شـــەڕی دەرەکی

نەمایە، خێرا گەڕەکە هاوسێکان تێک بەردەبوون. ئەوەش لەسەر ئەو بنەما خێڵەکییە بنیات نراوە کە دەڵێت: (من و براکەم دەدەین بەسەر مامۆزاکانمدا؛ من و مامۆزاکانیشم دەدەین بەسەر بێگانەدا).

شەقاوەش ئەو کەسەیە کە لە گەڕەکەکەدا بە قامک هێمای بۆ دەکرێت. ئەوەی هێرش دەکاتە سەر ماڵان و ڕێگە لە خەڵک دەگرێت و باج لە زەنگین دەسەنێت و کاتێکیش هەموو ئەمانە دەکات، هێشتاکێ لە بازنەی بەها خێڵەکییەکان نەچووەتە دەرێ و لە ڕووی ڕێز و نەوازش و پێگە و دەمارگیری و پیاوەتیدا ماوەتەوە، چونکە ئەو لە بێجگە لە گەڕەکەکەی خۆیدا کاری شەقاوەیەتی دەکات. بەڵام دەرهەق بە گەڕەکی خۆی، پارێزەرە و لە جەنگیشدا –ئەو جەنگانەی لەنێوان گەڕەکەکاندا هەڵدەگیرسێ؛ یان لەنێوان شارۆچکەکەی و هۆزەکانی دەوروپشتدا- شەڕکەرە.

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا، یەکێک لە شەقاوە دیارەکانی بەغدا بەناوی "عباس سبع: عەباسە دڕندە" لە جەنگێکدا لە دژی (دڕکییەکان)دا کوژرا. دڕکییەکان هاتن و بەستیانەوە بە کلکی ئەسپەوە و بەو شەقام و کۆڵانانەدا سەکێشیان کرد. شایەتی زیندوو هەیە دەگێڕێتەوە کە خەڵکی بۆ مەرگی شین و زارییان کردووە.

پەرسا: دێینە سەر باسی دووەمی سێ گریمانەکەت، ئەویش دووفاقیی کەسێتییە؛ ئەوەی کەسایەتیی عێراقییت پێ پێناسە کردووە، (و گفتوگۆ لەنێوان سەددام حوسێن سەرۆکی عێراق و ڕۆژنامەنوسی ئەمریکی کریستینا هێلمن لە ٢٢ی ئابی ١٩٨٢ کرا)... ڕات لەم بارەیەوە چییە؟

دکتۆر: گریمانەی (دوفاقیی کەسایەتی)ـم لە کتێبێکدا باس کردووە کە بەر لە ٣٤ ساڵ نوسیومە و هەوڵیشم داوە باسی کەسایەتیی تاکی عێراقی لە سەردەمی عوسمانی و ماوەی نێوان دوو جەنگەکەدا بکەم؛ جەخار کە توێژەرە ئەمریکییەکە ئەوەی دەرک نەکردبوو و وای

زانیبوو مەبەستم کەسایەتیی تاکی عێراقییە لە ئێستا و ئەمڕۆدا. نابێت بیرمان بچێتەوە کە لەمڕۆدا کەسایەتیی عێراقی زۆر گۆڕاوە؛ ئەمەش بابەتێکە بەڵکوو پاشتر بێمەوە سەری[٩].

کەسایەتیی عێراقی لە دەورانی دەوڵەتی عوسمانییدا دووفاق بوو چونکە لەژێر سێبەری دوو بەهای دژیەکدا دەژیا؛ بەهای خێڵەکی لە لایەکەوە و بەهای دینی لە لاکەی ترەوە. هەموو منداڵێک لەسایەی کاریگەریی بەها خێڵەکییەکاندا گەشەی دەکرد -ئەوەی کەمێک لەمەوبەر باسمان کرد- وەک دەمارگیری و تۆڵەسەندنەوە و پیاوەتی و شەرەف و شەڕ و بەزاندن و... تا ئەوەی منداڵەکە گەورە دەبوو و هێدی هێدی بەها دینییەکان بە هاوڕێیەتی لەگەڵ بەها خێڵەکییەکاندا کاریگەرییان لەسەری جێ دەهێشت. وەک ئاشکرایە، ئایین بەها خێڵەکییەکان بەرتەک دەداتەوە و پاڵیان بەرەو دواوە پێوە دەنێ؛ وەعزە دینییەکانیش پڕیانە لە نەفیکردنی ئەو بەهایانە و حەرامکردنیان. ئەو بانگەواز بۆ لەخواترسان، ئارامگری، بەخشین و "دانی مافی هەرکەس بە خۆی" دەکات.

کێشەی تاکیش لەم سەردەمەدا ئەوەیە، گوێ لەو وەعزانە دەگرێت و لە ڕووواڵەتدا پێیان سەرسام دەبێت. پاشان ئەو دێت وەعز بەگوێی ئەوانەدا دەدات کە لەخۆی کەم تەمەنتر یان کەم زانیاری ترن. بەڵام گوێڕایەڵییەکەی بۆ ئەو وەعزانە تەنها لە چوارچێوەی قسەدایە و بەس. ئیدی لە ژیانە کردەییەکەیدا گشتیانی بیر دەچێتەوە و لەسەر نەریتە لاکۆڵانییەکانی خۆی بەڕێوە دەڕوات کە لەسەری گەورە بووە و لە قووڵاییەکانی دڵ و گیانیدا نیشتووە. ئەو بەم گوێرەیە دەبێتە خاوەنی

[٩] - ئەوەندەی بەندە ئەو کتێبەم وەرگێڕابێت و لێی تێگەیشتبم، دکتور بەهەلەدا چووە و باسی کەسایەتیی تاکی عێراقی لە سەردەمی خۆشیدا زۆر بەڕوونی دەکات و کەمترین باسی سەردەمانی پێشتری تێدایە! وەرگێڕ

دوو کەسایەتی؛ یەکێکیان پێڕۆکەی دەستی بەها لاکۆلانییەکانە و ئەوی دیکەشیان هیی دەستی بەها دینییەکان.

**ئایا دووڕوویی پەیوەندیی بە دووفاقیی کەسایەتییەوە هەیە، یان ئەوەتا دوو شتی لێک جودان؟**

دوکتۆر: دووڕوویی شتێکی هەستەکییە، بەڵام دووفاقی نەستییە یان بێمەبەستە؛ واتە دووڕوو خۆی دەزانێت دووڕووە و ئەو کارەشی بۆ دەسخستنی مەبەست و مرازێک دەکات. بەڵام دووفاق نازانێت کە دووفاقە. ئەو لە کاتی وەعزدا لەخواترسە، کەچی لە کاتەکانی دیکەدا شەقاوەیە. شایەنی باسە دووفاقی لە گشت کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا هەیە، هێندە هەیە هێز و تینەکەی لە یەکێکەوە بۆ ئەوی دی بەپێی دۆخەکەی دەگۆڕێت. بەڵام کۆمەڵگە سەرەتایی و خێڵەکییەکان بەشێوەیەکی گشتی خاڵین لە دووفاقی. کابرای بیابانشین تووشی دووفاقی نابێتەوە چونکە هەر یەک کۆمەڵە بەها دەورەیان داوە، ئەویش بەها خێڵەکییەکانن. کەچی هەر کە بە شارستانییەتدا هەڵتەقی یان گوێی لە وەعزێکی دینی بوو، خێرا دووفاقی لە هەناویدا دەست بە داگیرسان دەکات.

**لێرەوە دەچینە سەر گریمانەی سێهەم لە گریمانەکانت، کە ئەویشت ناو ناوە (نامۆیی کۆمەڵایەتی). مەبەستت لەمە چییە؟ ج کاریگەرییەکیشی لەسەر ژیانە کۆمەڵایەتییەکەمان هەیە؟**

دوکتۆر عەلی وەردی: نامۆیی کۆمەڵایەتی توشی هەر کۆمەڵگەیەک دەبێت کە لەبەردەم گۆڕانی کۆمەڵایەتییدا بێت. هەتا ئەو گۆڕانەش خێراتر بێت، نامۆییەکەش گەورەتر و زۆرتر دەبێت.

کۆمەڵگە لە کاتی نەهامەتییدا بەتوندی خۆی بە خۆیەوە بەند دەکات. پارچەکانی کۆمەڵگە تێک دەسمڕێن و هیچ جۆرە ناکۆکییەکیان تێدا وەدی ناکرێت. ئەمە ڕێک و پێک کۆمەڵگەی عێراقی بوو لە سەدەی هەژدەهەمی زایینی. ئەو دەمەشی لە نەهامەتییەکی بەشەکی (جزئی)دا خۆی بینییەوە تا گەیشتە نیوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم و چەکەرەی شارستانییەتی نوێی چەشنی پاپۆڕ، تەلەگراف، تراموای، ڕادیۆ، سەیارە و شەمەندەفەر. کۆمەڵگە لەژێر کاریگەریی ئەم داهێنراوە نوێیانەدا دەستی بە گۆڕان کرد. بەڵام گۆڕانەکە هێواش بوو، بۆیەکانی نامۆییە کۆمەڵایەتییەکەش سست بوو.

جەنگی یەکەمی جیهانی ڕووداوێکی هەرە زل و کاریگەر بوو بۆ عێراق چونکە لە دۆخێکەوە ڕایگوێستە دۆخێکی دیکە. ئیدی شارستانییەتی هاوچەرخیش لەپاش جەنگ بە گشت داهێنراو و سیستەم و بیرییەوە لە عێراقدا خۆی دیتەوە؛ دەرەنجامی ئەمەش گۆڕانێکی خێرای ڕێژەیی بوو؛ لێرەشەوە نامۆیی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی ڕوون کەوتە گەڕ.

بیستەکانم باش بیرە، پاش جەنگی یەکەمی جیهانی، کاتێک ململانێی گەورە لەنێوان پارێزکارەکان و نوێخوازەکاندا سەری هەڵدا. هەر شتێکی نوێ لە شارستانییەتی هاوچەرخەوە دەهات، تاقمێک لە تاقمان ڕووبەڕووی دەوەستانەوە و بە کوفر و زەندەقە و تاوان و وێرانکارییان لەقەڵەم دەدا. مشتومڕ لەسەر خۆداپۆشین و دانەپۆشینی ژنان، ڕیش تاشینی پیاوان، چوونە قوتابخانەی منداڵان، خوێندنەوەی کتێبان، خواردنی چێشت بە کەوچک، گۆییبوونی زەوی و دروستبوونی باران لە هەڵمەوە و زۆرێک بابەت و ئارێشەی دیکە. تەنانەت پۆشاکی نوێش لەو ڕەخنە و گازەندانە بێ بەش نەکرا. هەندێک لە خوێندکارەکان -کە منیش یەکێکیان بووم- ناچار کران بە پۆشاکی جارانیانەوە -نەک هی نوێ- تا بەرقاپیی خوێندنگە بڕۆن و

لەویٚ خۆیان بگۆڕن. ئەمە ئەوە بوو کە خوێندکارە کچەکان دەیانکرد و ئێســـتاش دەیکەن کاتێک دەچنە کۆلێژ کە لە ژوورە تایبەتەکەی خۆیان عەباکانیان بە چلاکدا هەڵدەواسن.

دوکتۆر دەیداتە دەمی و دەڵێ:

پاشان ئەم سەردەمەی ئێستامان گەیشت کە بەخێرایی گۆڕانکاری تێیدا ڕوو دەدات؛ بە شـێوەیەک گۆڕان تێیدا لە گشـت سـەردەمەکانی دیکە زیاترە. شـــایەنی باســـیشـــە کە ململانێی نێوان پارێزکار و نوێخوازەکان لەم ســـەردەمەدا دامردووەتەوە و، جۆرە ململانێیەکی دیکە جێگەی گرتووەتەوە و پارێزکارەکانیش ناچار بوون مل بۆ ئەو شەپۆلە نوێخوازییە کەچ بکەن. بۆ نموونە ئەوانەی لە بیستەکاندا دژی دانەپۆشـــراویی ژنان دەوەســـتانەوە، ئەمێســـتا کچەکانی خۆیان یان نەوەکـانیـان دانەپۆشـــراون و بگرە نەک هەر تەنهـا بەوەنـدەش ڕادەوەســـتن، بەڵکوو بـانگەشـــەی بۆ دەکەن و ئەمـانیش ووس ڕاوەســـتاون. کەســـانێک دەناســـم هێشـــتاش زیندوون، لە ڕابردوودا ســـەرســـەختانە دژایەتیی دانەپۆشـــراوییان دەکرد –یان هەر شـــتێکی نویٚ– کەچی ئێستا بەداخەوە لەگەڵ شەپۆلی نوێخوازییدا ملیان ناوە.[10]

**وا لە قسـەکانت دەگەم کە مەبەسـت لە ململانێی نێوان پارێزکار و نوێخوازەکان، نامۆیی کۆمەڵایەتییە، ئایا وایە؟**

دوکتۆر: ململانێی نێوان نوێخواز و کۆنەخوازەکـان یەکێکە لە نیشـــانەکانی نامۆیی کۆمەڵایەتی. ڕاســـتییت بویٚ نامۆیی کۆمەڵایەتی لەمە فراوانترە و بابەتێکی ئاڵۆزە کە لێرەکانیٚ بواری ئەوەمان نییە بە

---

[10] – بەپێی پێوەرەکانی دوکتور عەلی وەردی بێت، ئەمانە ئەوانەن کە ئیمـانیان بە شـارسـتانییەت هێناوە ئەگەرچی لە کۆتاییەکانی ژیانیشـیاندا بێت؛ ئیدی بۆ خراپە بەلایەوە و بەداخەوەیە بۆیان؟ وەرگێر.

تانیدا بچین... بەخوا برا بە پرســـیارەکانت ماندووت کردم وەک چۆن منیش بە وەڵامەکانم ماندووم کردیت... خودا لێت خۆش بێت!

بەڵام ئاڵۆزیی بابەتەکە نە ئەهڵێت لێی تێپەرین و نە بە قوڵاییشـــدا بچین..

هێنـدە بەســـە کە لە پێنـاســـەی نـامۆیی کۆمەڵایەتییـدا بڵێم: لێکهەڵوەشــــانێکە لە پەیوەنـدییە کۆمەڵایەتییەکـانـدا بە مەبەســـتی گۆڕانکارییەکی زیاتر لە هەندێک بەشـــی قەوارە کۆمەڵایەتییەکەدا بە گوێرەی هەندێک بەشـــی دیکەی. بەشـــی وا هەیە ئاســـان گۆڕانکاری قەبووڵ دەکات، وەک هۆکارەکانی گواســـتنەوە و نیشـــتەجێبوون و ڕێگەی چارەســـەرکردنی تەندروســـتی و ئەو شـێوانە؛ بەشـی دیکەش هەن پێچەوانەی ئەمانەن و بە ئاسـانی گۆڕانکارییان بەســـەردا نایەت، وەک بیروبڕوا تەقلیدییەکان و ســـرووتە بۆماوەکان و نەریتەکانی خۆهەڵنان و خۆ بادان بە پێگەی بەرزی کۆمەڵایەتییەوە.

**ئایا نموونەیەک بۆ ئەوە لەبەردەستە؟**

دوکتـۆر: ڕوونـترین نـموونە کە بـتوانـین لەبـارەی نـامـۆیی کۆمەڵایەتییەوە بیهێنینەوە، تـایبەتە بە پێگەی ژنی عێراقییەوە کە لە ئێســتادا خۆی هەڵکێشـاوەتە پێگەیەکی بەرزی ئازادیی وەها کە دایکی لە خەونیشدا نەیبینیوە. بەڵام پیاوان نەیانتوانیوە پێ بە پێی ئەو گۆڕانە خێرایە خۆیان فریا بخەن. ئەوان هێشـــتاش بیروبۆچوونی مێشـــکی باوکی خۆیانیان لە مێشکی خۆیاندا دەرهەق بە ژنان زەخیرە کردووە. پیاوانی ئەمڕۆ مەیلیان لێیە ئەو شـــتانە دووبارە بکەنەوە کە لە فیلمە خۆشـــەویســـتییەکاندا دەیانبینن، دەیانەوێت کچان فریو بدەن و باســـی عەشـــق و ئەوینیان بۆ بکەن. کەچی کە دەمی زەماوەند و ژنهێنان

نزیک بوویەوە، هەموو شـــتەکانی باوباپیرانیان لە مێشـــکیاندا زیت دەبنەوە و دەیانەوێت ژنێک بێنن لە تۆپە قوماشی دایکی خۆیان بێت.

ڕۆژنـامە عێراقییەکـان لەم مـاوەیەدا چیرۆکی ئەو بـاوکەیـان گێرابوویەوە کە لە کیفی کچەکەیدا نامەی دڵداریی دۆزیبوویەوە. کابرا ئەو دنیـایەی هێنـابوویە سـەر خۆی کە ئەوەی لە کیفی کچەکەیدا دۆزیبوویەوە؛ ئەمە چییە کچەکەی عاشـق بووە. ئەمەش شـتێکە بە پێوەری نەوەی ڕابردوو شـوورەییە و ئـابڕووچوونی خێزانی بۆ هەمیشـە بەدوای خۆیدا دێنێت. کێشـەی ئەم پیاوە ئەوەیە، کچەکەی لە سـەردەمی ئێسـتادا دەژی و چووەتە قوتابخانە. کەچی باوکەکە هێشتاش لە قەوانی سەردەمی پێشوو دەخوێنێـت. ئا لێرەدا نامۆیی کۆمەڵایەتی بەتەواوی دەدرەوشێتەوە.

## چەکێکی نهێنیی نوێ بەناوی (پاراسایکۆلۆژی)

## ململانێی دەوڵەتە گەورەکان بۆ دەرخستنی نهێنییەکانی

(گۆڤاری التضامن ١٢/ ٩/ ١٩٨٦، ژمارە ١٧٩)

پاراسایکۆلۆژی بریتییە لە زانستیی دەراساناسی کە بەشوێن توانا دەرئاسا دەروونییەکانی تاکدا دەگەڕێت کە خۆی لە سووسەکردن (التخاطر)[١١] و پێشگۆیی (التنبؤ) و چاوتیژی (البصیرة) دەبینێتەوە.

لە سەردەمی ستالین زانستی دەرئاسا دژایەتییەکی زۆری کرا و نەوێردرا پەردە لەسەر توێژینەوەی زانا ڕووسییەکان تا ساڵی ١٩٦٠ لادرێت!

لە ڕۆژێکی ساڵی ١٩٦٠، گۆڤاری (الهلال) باسی ساڵی (٢٠٠٠)ی کردووە و پرسیار لە هەندێک نوسەری سەدە دەکات کە ئەگەر تا ئەو ساڵە بمێنن، لەبارەی چییەوە دەنووسن؟ عەبباس مەحموود عەققادی ڕەحمەتی لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێت: حەزی لێیە تاکە داهێنانێکی گەورە ببینێت، ئەویش: ئەنجامی ئەزموونە نوێیەکانی زانستی پاراسایکۆلۆجیی نوێیە و دەڵێت: چاوەڕێی بەڵگە زانستییەکانم کە دەیسەلمێنن دەشێ هەست و شعوورەکان بەبێ ئامراز بگوازرێنەوە).

چەند ساڵێکیش بەر لەوە، وردتر بەتەواوی ساڵی ١٩٥٠، کۆمەڵناسی عێراقی، دوکتۆر عەلی وەردی کتێبێکی بەناونیشانی (دەرئاساکانی نەست) نوسی کە ئاماژەیە بۆ ئەم زانستە نوێیە.

---

[١١] - بەشکوو لای خوێنەر ڕوون بێت کە سووسەکردن لە شوێنی (التخاطر)ی عەرەبیدا دانراوە کە مانا وردترەکەی بریتییە لە دڵخوێندنەوە. بۆیە ئازیز لە هەر شوێنێکی لەمەولای کتێبەکەدا هەرکام لەو دوو وشەیەت پێشچاو کەوت، بزانە ئاوایە! وەرگێڕ

وا ئەمڕۆکەش ئەم زانستە لە هەموو کاتێک زیاتر باوی سەندووە.. توێژینەوەکانیش لەبارەیەوە مەودای زۆریان بڕیوە و، هەر لە پەساش ئاوڕی زیاتری لێ دەدرێتەوە. ئەوەتا توێژینەوەی زۆر و کتێبی فرە و گەلەئەزموون و هەواڵ کە گشتیان ڕاستیی بابەتەکە دەسەلمێنن، تا وای لێهاتووە زانستی دەرئاسا لە ئاستی تاکدا نەماوە، بەڵکوو خۆی کێش کردووەتەوە سنووری ئاستی دوو گەورە دەوڵەتی ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤیەت.

لای خۆشمان وەک عەرەب، هبوون گرنگییان بەم بابەتە دەدا و لەناو ئەوانەشدا دوکتۆر علی وەردی یەکێکیانە کە هەردوو پسپۆرییەکەی پێکەوە گرێ داوە.

ڕاستییەکەشی ئەوەیە، کەسانێکی زۆری وەک من دۆخەکە ناچاری کردوون خەریکی پیشەیەک بن کە تێیدا شارەزا نەبن. ئیدی هەرچی هەوڵ و کۆششیانە چەشنی تۆزی بەر بایە. کەسانێکی دیکەش هەن تەواو پێچەوانەی ئەمان کە بارودۆخ یارمەتیی داون بچن بەدەم ئەوەوە کە خۆیان بۆی ئامادە و گونجاون؛ بۆیە هەم بە خۆیان، هەمیش بە کۆمەڵگەکەیان سوودیان گەیاند.

شارستانییەتی هاوچەرخ خەریکە خۆی لە سەردەمێکدا دەبینێتەوە کە تێیدا دەویسترێت توانا و بەهرەکانی مرۆڤ هەر لە منداڵییەوە بدۆزرێتەوە و لەپاش دۆزینەوەی، ئاراستەی ئەو پیشەیە بکرێت کە بۆی گونجاو و لەبارە. ئەو سەردەمە نزیک یان دوور، هەر دەبێت بگات. بۆیە پێوەری پێشکەوتنی شارستانییەت بە نزیکبوونەوە لەم قۆناغە دەپێورێت و دەزانرێت.

وەبیرم دێت کاتی منداڵی، هەموومان بە ویستی خانەوادەکانمان یان ئەو پێوەر و دۆخانەی کە کۆمەڵگەکانمانی کێش دەکرد، دەبراینە سەر کاری جیاواز دیاواز. لەوێ پێگە، پارە، بەرتاو (نفوذ)، واستە کاریگەرییان لەسەر سەرکەوتن یان سەرنەکەوتن لە پیشەکاندا هەبوو

کە بۆی کێش دەکراین. ئیدی کەسـانێک کە هیچ ئەهلی زانین نەبوون، هەڵکشان؛ وەک چۆن کۆمەڵێک کە نەدەبوو داکەون کەچی بەرەوخوار لێژ بوونەوە؛ کۆمەڵگەش لەنێوان ئەم دووانەدا خۆمان خۆش!

**باسـی پەیوەندیی نێوان سـووسـەکردن و سـەرکەوتنت لە کاری بازرگانییدا کردووە و نموونەشـت بۆ هێناوەتەوە، کەچی باسـی پەیوەندییەکەی نێوانیانت نەکردووە لە کایە جیاوازەکانی ژیاندا. دەنگوباسێکی زۆریش لەبارەی (بەخت)ـەوە هەیە کە ڕۆڵی لە گشت کایەکاندا هەیە. ڕای ئێوە لەم بارەیەوە؟**

دوکتۆر: ئەوەی گوتت ڕاسـتە؛ هێزی سـووسـەکردن کاریگەریی زۆری لە بووارە جیاوازەکانی ژیاندا هەیە و لە تەنیشـت ئەمانەشـدا بازرگانی، سـیاسـەت، بەڕێوەبردن، سـەرکردایەتی، فەرمانڕەوایی، وتارویژی، دادوەری و فێرکردن و چالاکی گەلی دیکە کە پشـت بە پەیوەندیی بە دیگەرانەوە دەبەسـتێت. بۆ نموونە دەسـەڵاتدار یەکێکە لەوانەی زۆر زۆر پێویسـتی بە توانای سـوسـەکردنە تا بتوانێت دۆسـتەکانی هەڵبژێرێت و لە مرازی دڵ و تواناکانیان خەبەردار بێت. دەسـەڵاتدارێک کە لەم توانـایە بەشـی نەدرابێت، دەورەی بە بەرژەوەندیخوازان و دووڕووان قەرەباڵغ دەکرێت و گەمە و گاڵتە بە هەست و مەیلەکانی دەکەن و خۆیان دەگەیەننە پێگەی بەرز و لەوێش ڕا، زیان بە خۆی و سەرزەمینەکەشی دەگات.

بە هەرحاڵ! ئەم باسـە ئاوی زۆر دەکێشـێت و ئێرەش دەرەقەتی ئەو باسە نایە.

لە پەنا ئەوەشـدا زانایانی سـەدەی ڕابردوو ئیمانیان بە وەها توانایەکی دەرئاسا نەبوو و، ئەگەرەکینەی کەسێکیشیان بەو توانایەوە

دیتبا، خێرا پۆشـــاکی فێڵبازییان وەبەردا دەکرد و هێزەکەشـــیان بە فرتوفێڵ یان خەواندن پێناسە دەکرد!

کەچی لە کۆتاییەکانی سەدەی ڕابردووەوە، هێدی هێدی زانایان بە چاوی گرنگییەوە تەماشـــا و ئاوڕیان بەلایدا دایەوە و دەســـتیان دایە لێکۆڵینەوەی زانســـتیی و ئەم زانســـتە نوێیە پەرەی ســـتاند تا بەمڕۆ گەیشت.

**چما لە ئاســـتی دەوڵەت و حکومەتەکاندا، ئایا هەڵوێســـتی جیاواز لەبارەی ئەم زانستەوە هەبووە؟**

دوکتۆر: ئەوەی شـایەنی باسـە، یەکێتیی سـۆڤیەت بە چاوی گومان و نکۆڵیکردنەوە تەماشـــای ئەم زانســـتەی دەکرد؛ ئەوان وایان دانابوو ئەمە زانستێکی میتافیزیکییانەی بۆرژوازییە کە لە ڕێیەوە دەویستریێت خەڵکی بێهۆش بکرێت.

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە تا ساڵی ١٩٥٩ لەوێ درێژەی کێشا. ئەدی لەو ســـاڵەدا دەنگوباس گەیشـــتە دەزگای هەواڵگریی ســـۆڤیەت کە ئەمریکا ئەم زانسـتە بۆ هەندێک مەبەسـتی سـەربازی وەکار دەهێنێت؛ لێرەوە ترسـان ئەمریکا لەم گۆشـەیەوە بەسـەریاندا سـەرکەوێت. یەک هەناسـە لە هەڵوێسـتی دژایەتییەوە بایاندا بەلای پشـتیوانی و هانداندا. دەنگوباس وایە ســـۆڤیەت ئێســـتا لەپێش ئەمریکاوەیە و بگرە چەند قۆناغێکیش وەجێی هێشتبێت.

**ئەی لە ڕۆژئاوا ئەم زانستە کەی سەری هەڵدا و چۆن؟**

دوکتۆر: لە ڕۆژئاوا ئەم زانســـتە دوو دەســـپێکی هەیە، یەکێکیان ســـــاڵی ١٨٨٢، ئەوی دیکەیـان ١٩٣٢. لە ١٨٨٢دا کۆمەڵێک زانـا و

فەیلەســوف لە بەریتانیا کۆمەڵەیەکیان بۆ گرنگیدان بەم باس و بابەتە دامەزراند و نـاویشـــیـان لە کۆمەڵەکەیـان نـا (کۆمەڵەی لێکۆڵینەوە دەروونییەکـان). ئەم کۆمەڵەیە گۆڤـارێکی تـایبەت بە خۆشـــیـان دەردەکرد. یەکەم ســەرۆکیان ناوی (ســدجۆک) بوو کە مامۆســتای فەلســـەفە بوو لە زانکۆی کامبریج؛ ناوبراو لە وتاری دەســـپێکیدا لەبارەی مەبەستی کردنەوەی ئەم کۆمەڵەیە ئاوەهای وت:

(ئێمە زۆر لەبارەی کارە دەرئاســاکانەوە دەبیســتین کە ئەم و ئەو ئەنجامیان دەدەن و کەســـانی جێ متمانە بۆمانیان دەگێڕنەوە، کەچی بە ڕوو وەرچەرخاندنەوە مەســـخەرەیان پێ دەکەین. هەر بەڕاســتی شــوورەییە جیهانی شــارســتانی بێت و مشــتومڕی تاقمی بڕواپێکەر و تــاقمی بێ بڕا بەم بــابەتە دەگێڕێتەوە. خۆ ئەگەر دە یەکی ئەم هەواڵانەش ڕاست بن، ئەوا خۆی لە خۆیدا هەڵگری بەهایەکی زانستیی گاڵتە پێنەکراوە.

ئامانجی یەکەمی ئەم کۆمەڵەیە ئەوەیە، ئەم هەواڵ و دەنگوباسانەی ســەر زاری خەڵکی لە گشت شـوێن و کاتێکدا جەم بکاتەوە و لە قاڵبی مەرجەکانی زانستی بدات کە گومان هەڵناگرن. بۆیە ئێمە گەرەکمانە – ئیدی چ ئیماندارەکانمان یان بێ ئیمانەکانمان پێی- ســنوورێک بۆ ئەم گاڵتەجاڕییە دانێین کە ئەمڕۆ جیهانی هاوچەرخی پێوە دەتلێتەوە. ئێمە گەرەکمانە بە زانســتی ســەداســەد بزانین ئەم چیرۆکانەی ســەرزاری مەردووم ڕاســـتن یان نا؟ لە هەر چیرۆکێکیشـــدا کە دەیبیســـتین، کۆشــــشـــی خۆمان دەکەین تا ڕاددەی ڕاســـتێتییەکەی بزانین. ئێمە دەمانەوێت بزانین، نەک ئەوەی بەڵگە بۆ شــتێک بهێنینەوە کە پێشــتر زانیبێتمـان؛ ئیـدی بـا ئەنجـامەکەی ئەرێنی یـان نەرێنی بێـت، چ لە بابەتەکە ناگۆڕێت).

ئەوەبوو کۆمەڵەکە لەسەر ئەو ڕەوڕەوەیە چوو کە سدجۆک باسی کرد و لە دۆســـییەکەیـانـدا قەیرێکی زۆر بەڵگە و گەواهییـان جەم

کردەوە. ئەو لەو ماوەیەشـــدا دەســـتی نەپاراســـت لە ئاشـــکراکردنی ژمارەیەکی زۆر لە درۆ و دەلەســـــە کە دەهێنرانە لای و بۆی باس دەکران و، لە گۆڤـارەکەشـــیانـدا ئەو فێڵەرێگـایـانەی بـاس کرد کە کڵاوبەردارەکان دەیانگرتنە بەر.

وەک لە رێچکەی پەرەگرتنی ئەم زانســــتەدا دەردەکەوێت، ئەم کۆمەڵەیە سەرکەوتوو بوون لە هەوڵەکەیاندا؟

دوکتۆر: بەڵێ... ســــەرکەوتنەکەشـــیـان دەنگی لە چوارقورنەی رۆژئاوادا دایەوە... لە فەرەنســـا، ئەمریکا، هۆڵەندا، دانیمارک، نەرویج، پۆڵەندا و شوێنانی دیکەش لقی لێ کرایەوە...

**مادەم خۆمان بە رێرەوی گەشـەسـەندنی ئەم زانسـتەوە خەریک کردووە، با کەمێکی دیکەش بەدواداچوون بۆ پەرەســـەندنەکانی ئەم بووارە بکەین و زانینی لەبارەوە کۆ بکەینەوە؟**

دوکتۆر: لە ســـاڵی ١٩٣٢، زانا (راین) لە زانکۆی دیۆکی ئەمریکا، هەنگاوی دووهەمی لەم زانستەدا گرتە بەر و لە زانکۆکەدا بەشێکی بۆ ئەم مەبەســـتە کردەوە. بەڵام رێکارەکانی کە گرتییە بەر، جیاواز بوو لەو رێکـارانەی ئەو کۆمەڵەیە گرتبوویـانە بەر کە تۆزێـک لەمەوبەر باســـمان کرد. ئەوان دەگەڕان بەشـــوێن ئەو کەســـــانەدا کە لەم بەهرەیەیـان تێـدایە و لێکۆڵینەوەیـان لەبـارەوە دەکرد؛ بەڵام راین رێچکەیەکی دامەزرانـد کە لە هەموو تـاکێـک لە رێگەی ئـامـار و ئەزموونەوە بکۆڵێتەوە؛ بەو هەنجەتەی هەر تاکێک بەشـــێک لەم توانا دەرئاســـایەی تێدایە و کەم و زۆری کەوتووە. زۆرێک لە مەردووم بە ئاستێکی کەم لەم بەهرەیەیان تێدایە کە خۆشیان هەستی پێ ناکەن و کاریگەرییشـی لەسـەر ژیانیان نابێت. کەچی لەملاوە کەسانێک هەن بە

ڕێژەیەکی زۆرتر تێیاندایە و دەتوانن لە بازنەی کۆمەڵایەتی و ئابووری یان بواری دیکەدا وەبەرهێنانی پێ بکەن.

دوکتۆر عەلی وەردی دەیداتە دەمی و درێژە بە دەسکەوتەکانی مامۆستا ڕاین لەم بووارەدا دەدات:

مامۆستا ڕاین چەند کتێبێکی لەم بارەیەوە نوسیوە و ئەو ئامارانەشی خستووەتە ڕوو کە وەدەستی خستووە و پێیان گەیشتووە. ئامارەکانیش بوونە جێگەی مقۆمقۆیەکی زۆر لە ناوەندە زانستییەکانی ئەمریکادا. لە سەرەتاشدا زۆرێک لە زانایان هەڵویستی دژیان دەرهەق بە لێکۆڵینەوەکانی ڕاین گرتە بەر. بەڵام مشتومڕ و مقۆمقۆکە بە تێپەڕینی کات دای لە کزی و بگرە هەندێک زانکۆ لە ئەمریکا و بێجگە ئەویش، بەشی تایبەتیان بۆ ئەم زانستە کردەوە. دواتر ئەو ناوەش(پاراسایکۆلۆژی) کەوتە ناو ناوان کە ڕاین بۆی هەڵبژاردبوو و من بۆ عەرەبییەکەی (علم الخارقیة: دەرئاساناسی)ـەم لا پەسەندە.

**هێندەی لێت ڕوون بووبێتەوە، چ پاڵنەرێکی هەبووە وا توخنی ئەم جۆرە زانستە کەوتووە؟**

دوکتۆر: ڕاین لە یەکێک لە کتێبەکانیدا هۆکەیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کاتێک باسی خاتوونێکی ناسراوی دەکات کە شەوێک دەخەوێت لە خەونیدا براکەی دێتە ماڵەکەیان، پاشان تفەنگەکەی دەردێنێت و تەقە لە خۆی دەکات. لە خەونەکەیدا دەبینێت هێواش لار دەبێتەوە و تفەنگەکەی لەدەست بەردەبێتەوە. خاتوونەکە وەخەبەر دێتەوە خەڵتانی ناو ترس بووە؛ زۆر لە هاوسەرەکەی دەکات سواری گالیسکەکەیان بن و بچنە سەردانی براکەی کە ماڵیان لەمانەوە تۆزێکیش دوورە. کە دەگەنە ئەوێ، خاتوونە دەحەپەسێت کاتێک

دەبینێت لاشـــەی براکەی بەتەواوی لەو شـــوێنەدا کەوتووە کە ئەم بینویەتی و تفەنگەکەش بە شێوەی خەونەکە لە پەنایدا درێژ کەوتووە.

ڕاین جەخت لەســەر ڕاســتیی ئەم ڕووداوە دەکاتەوە و پشــت بە متمانەی گێڕەرەوەکە دەبەستێت.

ئەو لە ڕاڤەکردنی ئەم ڕووداوەدا شـــوێنپێی زانایانی ســـەدەی ڕابردوو لەم بوارەدا هەڵناگرێت کە دەهاتن و ڕاڤەیان وەک ڕێکەوتێک دەکرد. وردەکارییەکانی خەونی ئەم خاتوونە هەم زۆرن و هەمیش ئاڵۆز. ئاســـان نییە هەروا بێین و بڵێین ڕێکەوتە و ئاو بێنە و دەســـت بشـۆ. بێ شـک دەبێت هۆکاری دیکەش هەبن. ئەمە پاڵنەری ڕاین بوو بۆ توێژینەوە و لێوردبوونەوەکانی دواتری لەم بووارەدا.

**باسی ئەوە دەکەن لە سەرەتادا بەرهەڵستیی لێکۆڵینەوەکانی ڕاین کراوە، چ بە بەرپەرچدانەوە، چ وەدرۆخســـتنەوەی لەلایەن زۆرێک لە زانایانەوە. هۆی ئەو هەڵوێستەی زانایان دەرهەق بەم زانستە چییە؟**

دوکتور: نابێت ئەوەمان بیر بچێتەوە کە نامووســـێکی کۆمەڵایەتی لە گشـت شـوێن و کاتێکدا هەیە: هەر شـتێکی نوێ بێتە گۆڕێ، دەبێت دژی بوەســتنەوە و ڕێگەی لێ بگرن. ئەو یاســایە تەنها ڕەشـەخەڵکی تێدا جێ نابێتەوە، بەڵکوو زانایانیش. خۆ زانایانیش لە ســـروشـــتیاندا وەک هەمووان مرۆڤن.

ڕاین بۆمـان بـاس دەکـات کە بەرهەڵســـتییەکی گەورەی لەلایەن ناوەندە زانســـتییەکانەوە کراوە ئەو کـاتەی نیـازی بووە بەشـــی دەرئاســـاناســـی لە زانکۆی دیوک بکاتەوە. زۆرێک لە مامۆســـتایانی زانکۆیی مەیلیان بەلای ئەوەدا چووە کە ئەم زانسـتە لە توپە قوماشـی خورافە و ســـووکییە. هەندێکیشـــیان بڕوایان بە ڕاســـتییەکەی هەبوو، بەلام حەزیان نەدەکرد دەری بخەن... دەهاتن ئەزمونەکانیان بەنهێنیی

ئەنجام دەدا نەبادا هاوڕێکانیان پێیان بزانن و ببنە جێگەی مەسخەرە. ڕاین چیرۆکی یەکێکیان دەگێڕێتەوە کە گەلەئەزموونێکی ئەنجام داوە و لە کۆتایشدا گەیشتووەتە کۆمەڵە ئەنجامێکی گرنگ، کەچی خۆی نەیهێشتووە چاپ ببن و وتوویەتی: خێزانەکەم پێویستیان بە نانە – واتە ترساوە دوای چاپ بوون، زانکۆ دەری بکەن و خێزانەکەی بێ شێو سەر بنێنەوە.

**بە بڕوای تۆ، ئەو ڕێگرییانەی تا پێش ساڵی ١٩٥٩ لە سۆڤیەت کراون، لەوانە دەچێت کە لە سییەکان لە ئەمریکا دەکرا؟**

دوکتۆر: ڕێگرییەکان لە ئەمریکا، تەنها لە ناوەندە زانستییەکان بوو و دەوڵەت هیچ دەستێکی تێوەرنەدەدا؛ کەچی لە ڕووسیا، دەوڵەت خۆی نوێنەرایەتیی ڕێگرییەکەی گرتبوویە ئەستۆ چونکە زانستەکەی بە زانستێکی میتافیزیکیی بۆرژوازییانە لەقەڵەم دابوو و وای دەکرد نەش و نمای ڕۆحیی و دینی لەناو خەڵکیدا پەرە بگرێتەوە.

ترۆپکی ڕێگریەکانی ڕووسیا لە سەردەمی ستالیندا بوو. ئەو سەردەمەی ناوی بە داگیرکاریی و "کەسایەتی پەرەستی" دەرکردبوو. دوکتۆر فاسیلیف، سەرۆکی بەشی فەسلەجەی زانکۆی لینینگراد دەڵێت لە سەردەمی ستالیندا بەنهێنی کاری لەسەر دەرئاساناسی کردووە و، پەردەی لەسەر لێکۆڵینەوەکانی تا سەرەتاکانی ١٩٦٠ لا نەداوە تا ئەوەی دەوڵەت خۆی بانگی دەکەن و داوای لێکۆڵینەوەی لێ دەکەن!

دوکتۆر وەردی دەیداتە دەمی و دەڵێت:

دەشێ بوترێ: بە شێوەیەکی گشتی "مادده بنچینەی فەلسەفەی مارکسییە"؛ هەر بۆیەشە مارکسییە دەقییەکان دژی هەر بابەتێک ڕادەوەستنەوە کە تەفسیرێکی ماددی هەڵنەگرێت؛ ئەم تێڕوانینەش لە

سـەردەمی سـتالیندا گەشـەی تەواوی کرد؛ ئەوەش هۆی ئەو ڕێگرییە زۆرەی سەردەمەکەیەتی.

**تۆش هەر زوو لەسـەر ئەم زانایەت نوسـیوە! پێمان بڵێ توشـی چ بەربەست و ڕووبەڕووبوونەوەیەک بوویتەوە؟**

دوکتۆر: ئەوەی لەم بارەیەوە بیرم بێت، سـاڵی ١٩٥٢ کە کتێبی (دەرئاساکانی نەست)م نوسی و ساڵی ١٩٥٩ش کتێبی (خەون لەنێوان زانست و باوەڕدا)، مارکسییەکان بەرهەڵستییەکی زۆریان کرد و جنێوی باشیشیان بە نوسـەرەکانیان دا، چونکە شـتێکیان لەبارەی (ڕاڤەی دەرئاسا) تێدا دەبینییەوە، بەتایبەت لە بابەتی خەوندا.

لە سـاڵی ١٩٦٠یشـدا یەکێک لە مامۆسـتا مارکسـییەکانی هەڵگری بڕوانـامەی دکتۆرا ڕەخنەوتـارێکی درێژی لە یەکێـک لە ڕۆژنـامە مارکسـییەکاندا نوسـی و تێیدا وتی: بابەتی "هەواڵی خەونی" لە بابەتە میتافیزیکییەکانەوە کە زانست بە هیچ ئەنجامێک نەگەیشتووە و پێشی ناگات. خۆ ئەگەریش ئەفسـانە و ئوسـتوورە پرسـیارێکمان ئاڕاسـتە بکەن و بڵێن: ئایا خەون دەتوانێت هەواڵ لە داهاتوو بدات؟ ئێمەش بە نەرێ وەڵام دەدەینەوە چونکە ئەو بنچینەیەی پرسـیارەکەی لەسـەر دامەزراوە خورافە و ئەفسانەیە!

سـەیر لەوەدایە، هەر پاش چەند هەفتەیەک لە ڕووسـیاوە هەواڵ گەیشتێ کە وڵاتەکەیان هەڵوێستی دەرهەق بە زانستەکە لە هەڵوێستی دژەوە بۆ پاڵپشـتی گۆڕیوە. ئیدی نازانم چی بەسـەر ئەو دکتۆرە هات ئایا هەر هەڵوێستی گۆڕی یان هەر لەسەر ئەوە مایەوە کە هەبوو!

**بە بڕوای تۆ، هۆی ئەو گۆڕانە لەناکاوە لە هەڵوێستی یەکێتیی سۆڤیەتدا چی بوو؟**

دوکتۆر: لە ساڵی ١٩٥٩، ڕۆژنامە فەرەنسییەکان هەواڵێکیان بە ناونیشانێکی زەقەوە بڵاو کردەوە لەبارەی ژێردەریایی گەردیلەیی ئەمریکی (تاوتیلۆس)؛ ناونیشانی هەواڵەکە: حکوومەتی ئەمریکی لەناو ژێردەرياييەکەدا کەسێکی بەکار هێناوە کە خاوەنی توانایەکی گەورەی سووسەکردنە و لە ڕێگەی ئەو توانایەوە دەتوانێت پەیوەندی بە کەسێکی دیکەوە بگرێت کە دوورە لێی. ڕۆژنامە فەرەنسییەکان پرسیویانە: (ئایا سووسەکردن چەکێکی نوێی نهێنییە؟ ئایا ئەم هێزی سووسەکردنە لە جەنگەکانی داهاتوودا ڕۆڵی گەورە و یەکلاکەرەوە دەبینن؟ ئایا سەربازە ئەمریکییەکان سەرکەوتوو بوون لە دەرخستنی هێزی شاراوەی ڕۆح دا؟)

ئەم هەواڵە و گشت پەراوێزەکانی، بوونە جێگەی گرنگیی ناوەندە سیاسیی و هاڵگرییەکانی یەکێتیی سۆڤیەت. هەرچەندە دەوڵەتی ئەمریکا هەواڵەکەی بەدرۆ خستەوە، کەچی دەوڵەتی سۆڤیەت بڕوای بە بەدرۆخستنەوەکە نەکرد. ڕەنگە وایان زانیبێت ئەو بەدرۆخستنەوەیە بۆ فرت و فێڵ و گێلکردن بێت. ڕەنگە ڕووسیا لەوە ترسابێت بێ خەبەر ئەمریکا بدات بەلایدا و لەو بووارەدا جێی بهێڵێت!

هەر لەو سەر و سەدایەدا دەزگای هەواڵگریی سۆڤیەت زانییان ماوتسی تۆنگ، سەرۆکی چین دەوڵەتی ڕاسپاردووە لەو بارەیەوە دەست بە توێژینەوە بکەن. دەنگوباس وا بڵاو بوویەوە و، ئەمەش کەوتە پاڵ ترسەکەی دەوڵەتی سۆڤیەتەوە؛ هەر بۆیە کۆششی زیاتریان لەو بارەوە بەخەرج دا.

هەروەتر، دوکتۆر فاسیلیڤ لەلایەن دەوڵەتەوە بانگێشت کرا کە خۆی بۆ ئەو زانستە نوێیە تەرخان بکات و داهاتێکی زەبەلاحیشیان خستە خزمەت. ئەویش تاقیگەیەکی تایبەتی بەو زانستە لەسەر

تێچووی دەوڵەت کردەوە کە دەبێتە یەکەم تاقیگە لەو بووارەدا پاش تاقیگەکەی دانیمارک.

چۆن بوو ئەو بەخێرهاتنەی ئەو زانستە قەدەغەیە کرا کە دواتر دانی پێدا نرا و بگرە نەک دانپێدانان، بەڵکوو گرنگییەکی فەرمیشی پێ درا؟

دوکتۆر: لەم بارەیەوە چەند بەڵگەنامەیەک هەن. لە ساڵی ١٩٦٠ ئاهەنگێکی گەورە بە ئامادەیی گەورە زانایانی ڕووسی بەهۆی داهێنانی ڕادیۆوە گێڕدرا. هەر لەو ئاهەنگەدا فاسیلیڤ هەستایەوە و ئامادەبووانی شۆک کرد بە باسکردنی ڕادیۆی عەقڵی و وتی:

(لە سەردەمی ستالیندا هەستاین بە لێکۆڵینەوەی قووڵی بواری توانا دەرونییە دەرئاساکان، بەڵام هەرگیز یەک شتیشمان لێ ئاشکرا نەکرد. ئەمڕۆش ژێردەریاییە ئەمریکییەکان هەستاون بە کۆمەڵێک ئەزموونی سووسە و ختوورەکردن. بۆیە پێویستە خۆمان لە بڕیارەکانی پێشوومان ڕەها بکەین؛ لەسەرمانە سەرلەنوێ ئەم مەیدانە دەر بخەین کە خاوەنی زیندوویەکی زۆرە).

پاشان ناوبراو دایە دەم قسەکانی و وتی: (دەرخستنی ئەو وزەیەی کە توانا دەروونییە دەرئاساکان نوێنەرایەتیی دەکەن، هیچی کەمتر نییە لە دۆزینەوەی وزەی ئەتۆمی).

ئەوەبوو ساڵەوساڵ ژمارەی تاقیگەکان بۆ ئەم زانستە زیادیان دەکرد؛ دەوڵەتە کۆمۆنیزمییەکانی دیکەش چاویان لەم دەکرد، بەتایبەتییش چیکۆسلۆڤاکیا و دەوڵەتی سۆڤیەتیش لە ساڵی ١٩٦٧ زیاتر لە ١٢ ملیۆن ڕۆبڵی بۆ ئەم بابەتە تەرخان کرد و ساڵەوساڵیش بودجەکەی زیاتر دەکرد تا گەیشتە ٢٠ ملیۆن ڕۆبڵ.

دەوڵەتی سۆڤیەت هەر بەوەندەوە نەوەستا، بەڵکوو ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ دەوڵەتی هیند واژۆ کرد کە هەندێک لە

یۆگاییەکان بنێریتە ڕووسیا تا ببنە پشتیوان لە لێکۆڵینەوەی کارە دەرئاسا سەمەرەکان کە هەندیک لە هیندەکان لە ڕێگەی یۆگاوە ناویان پی دەرکردووە.

**ئایا دەسکەوت یان ئەزموونی تایبەتیان لەم بووارەدا وەدەست هێنا؟**

دوکتۆر: یەکەمین کارێک کە زانایانی ڕووس لەم بووارەدا ئەنجامیاندا، لەنێوان گیانەوەراندا بوو. هاتن و کەروێشکێکیان هێنا دوای ئەوەی بەچکەی کرد، بردیانە تاقیگە و دەماخیان بە ئامێر دەورە دا تا لەرەلەرکانی بپێون. ئەوجا هاتن و بەچکەکانیان خستە ژێردەریاییەکی دوورەوە لێی و یەک یەک بەچکەکانیان دەکوشت؛ بینییان دەماخی ئەم دایکانەیە گرژبوونێکی لە کاتی کوشتنی هەریەک لە بێچووەکانیدا تێدا دروست دەبێت. لە ئەنجامدا گەیشتنە ئەوەی جۆرێک لە پەیوەندیی کارۆتیسی لەنێوان دایکانە و بەچکەکەیدا هەیە، هەرچەندەش لێک دوور بن.

لە نیسانی ١٩٦٦یشدا زانایانی ڕووس ئەزموونێکی هاوشێوەیان لەسەر مرۆڤ کرد و لە شاری (نۆڤۆسیبریسک) کە دەکەوێتە هەرێمی سیبریا، دووری سێ هەزار کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی شاری مۆسکۆ، ئەزموون لەسەر پیاوێک کرا کە خاوەنی هێزێکی گەورەی سووسەکردن بوو بەناوی (نیکۆلائیف) لەگەڵ کاورایەکیش لە شاری مۆسکۆوە بەناوی (کامنسکی) ئاگایان لە یەکدی بوو. لە کۆتاییدا زانایان بۆیان دەرکەوت جۆرێک پەیوەندیی کارۆتیسی لەنێوانیاندا هەیە.

ئەم دوو ئەزموونەی زانایانی ڕووس بوونە دەنگوباسی جیهان و، ئێزگە هەواڵییەکان پەخشیان کردنەوە. ئیدی دەوڵەتی سۆڤیەت ناچار

بوو کاره دەرئاساکان بە نهێنیی ئەنجام بدات. دوکتۆر میلان دیزل – کە یەکێکە لە زانا چیکییەکانی ئەم بووارە- ڕاشکاوانە وتی: ڕوسیا پشکی شێری توێژینەوە نهێنییەکانی بۆ هێزە دەرئاسا دەروونییەکان دابین دەکات کە ئەم توێژینەوانە مەبەستیان خزمەتکردنی ئاسایشی دەوڵەت و بەرگری لێکردنییەتی).

**ئایا هیچ بەرچەکردارێکی ئەمریکی دژی دەسکەوتەکانی یەکێتیی سۆڤیەت هەبووە؟**

دوکتۆر: دەوڵەتی ئەمریکا لە سەرەتاوە گرنگییەکی ئەوتۆی بە بابەتەکە نەدا و هیچ بڕە بودجەیەکی تایبەتییشی بۆ تەرخان نەکرد. ئەو گرنگیپێدانەش کە هەبوو، لەلایەن گرووپ و کۆمەڵە خۆجێییەکانەوە بوو. کەچی لەم دوادواییانەدا بۆی دەرکەوت چ کەمتەرخەمییەکی لەم بارەیەوە کردووە و ڕوسیاش پێشی داوەتەوە، یان پێشی دەداتەوە؛ ئیدی لێرەڕا گوژمە پارەی زۆری بۆ تەرخان کرد و خستیشییە چوارچێوەی نهێنییە سەربازی و ئاسایشییەکان.

ئەوەی بوویە جێگەی سەرنجی حکوومەتی ئەمریکا لەم بوارەدا ئەوەبوو: کۆمەڵێک مووشەکی (ئێم ئێکس)ـی شاردبوویەوە، کەچی دواتر شوێنەکەی لە ڕێگەی چەند کەسێکی خاوەن توانای تایبەتەوە دوزرایەوە. ئەوەش واتای ئەوەیە زۆرێک لە نهێنییە سەربازییەکان چیدی بە نهێنی نامێننەوە و دەرئاساناسی ڕۆڵی خۆی لە جەنگەکانی داهاتوودا دەبینێت.

لە ساڵی ١٩٨٤، کتێبێک بەناوی (جەنگی عەقڵەکان) دەرچوو. نوسەر تێیدا مشتومڕی ئەم بابەتە نهێنییانەی دەکرد. ئەندامی گۆنگرێسی ئەمریکا، چارلی ڕۆزیش ئاشکرای کرد: (ئەگەری جەنگە دەروونییەکان لە واقیعەوە زۆر نزیکن. ڕەنگە زۆریش گرنگ بێت

دەستوبرد بکریت لە تویژینەوە دەرئاساییەکاندا بەو شیوەیەی نزیکەی چل ساڵ لەمەوبەر دەستوبرد کرا لە لیکۆڵینەوە ئەتۆمییەکاندا و بوویە مایەی بەرهەم هاتنی بۆمبی ئەتۆمی).

بەر لەوەش، لە ساڵی ١٩٧٧، ئیزگە هەواڵییەکان هەواڵیکی گرنگییان لەم بارەیەوە ڕاگویێست. ئەویش: دەستگیرکرانی ڕۆژنامەنوسیکی ئەمریکی بوو بەناوی (ڕۆبیرت ڕۆث) کە گوایە بە سیخوڕیی لەسەر تویژینەوە دەرئاساکان تۆمەتبار کرابوو کە لە ڕوسیا ئەنجام دەدرین. ئەگەر ئەوە ڕاست بیت، مانای وایە ئەمریکا سیخوڕی بەسەر ڕوسیاوە لە دەرئاساناسییدا دەکات، وەک چۆن پیشتر ڕوسیا لە بۆمبی ئەتۆمییدا بەسەر ئەمریکاوە کردی.

## فەرمانڕەوایەک هێزی سووسەکردنی نەبێت، بە دووڕوو و بەرژەوەندیخواز دەورە دەدرێت

(گۆڤاری التضامن، ٢٤/ ١/ ١٩٨٧، ژمارە ١٩٨)

لە هەڵقەی چوارەم کە لێرەدا بڵاوی دەکەینەوە، باسوخواسەکەمان لەبارەی هێزی سووسەکردنەوەیە. یەکێک لە هێزە دەرئاساکان کە زانستی (پاراسایکۆلۆجی) گرنگیی پێ دەدات پێی دەگوترێت (Telepathy). وتراوە ئەمە کاریگەرترین هێزی دەرئاسایە لە سەرکەوتنی مرۆڤ لە ژیاندا.

دەنگوباس وا بڵاوە کە دەوڵەتی سۆڤیەت گرنگیی پێ دەدات و توێژەرە سۆڤیەتییەکان تێیدا گەیشتوونەتە ئەنجامی گرنگ.

ئەو پرسیارەی دەمانەوێت لە جەنابتی بکەین ئەوەیە:

**هۆی چییە لێکۆڵەرە سۆڤیەتییەکان زیاتر لە هەمووان گرنگیی پێ دەدەن؟ ئەی ئایا گرنگترین ئەنجامەکان پێی دەیشتوون چین؟**

دوکتۆر وەردی بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:

دوکتۆر: زانیاریی پێویستم لەم بارەیەوە نییە. واشی بۆ دەچم زانا سۆڤیەتییەکان وایان زانیبێت دەشێت تەفسیرێکی ماددی بۆ ئەم دیاردەیە بکرێت. واتە وەک تواناییەکانی دیکە بە مەتەڵ نەپێچراوەتەوە کە غەیبی و ڕۆحییەکان بۆ پاڵپشتیی بانگەشەکانیان بەکاری دێنن. نابێت بیریشمان بچێت کە فەلسەفەی مارکسی لە دیاردەکانی گەردووندا دژی هەموو تەفسیرە ڕۆحی وغەیبی و سەرنموونەییەکان ڕادەوەستێتەوە. لە چاوپێکەوتنی پێشوودا باسی ئەوەم کرد چۆن

دەوڵەتی سۆڤیەت دژی دەرئاسـاناسـی - لە سـەرەتای دەرکەوتنیدا- وەستایەوە و، بە زانستی چینی بۆرژوازی و میتافیزیکی ناو دەهێنا و تا ساڵی ١٩٥٩ــش هەر بەرەنگاری بوونەوە. دەستیشیان تێ وەرنەدا تـا زانییان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەنهێنیی بۆ کـاروباری سەربازی خەریکییەتی. ئیدی سۆڤیەتیش لەوە ترسا بێخەبەر بمێنێ و ئەمریکـا لەو بووارەدا پێشـــی بکەوێت. ئەوە پـاڵی پێوەنـا پـارە و توانایەکی زۆر لە گەشەپێدانی ئەو بووارە سەرف بکات.

دەشڵێن پێشی ئەمریکای داوەتەوە.

توێژەرە سۆڤیەتییەکان گەیشتوونەتە ئەو دەرەنجامەی کە دەشێ سـووسـەکردن بە لەرەلەری کارۆتیسـی (کارەبا و موگناتیس) ڕاڤە بکەن کە ئەم شەپۆلانە لە دەماخێکەوە بۆ دانەیەکی دیکە دەگوازرێنەوە تەواو بەو شـێوەیەی بێتەل لە ئـامێرێکەوە بۆ دانەیەکی دیکە دەگوازرێتەوە. دەمـاخی مرۆڤ دەتوانێت ببێتە ئامێری وەرگری ئەو شەپۆلانەی کە دەماخێکی دیکە دەینێرێت. هەر لێرەوەیە هەندێک کەس توانای خوێندنەوەی بیری دیکەرانیان هەیە؛ یان بیری خۆیان بەسـەر دیکەراندا دەچەسپێنن!

دوکتۆر قسە دەداتە دەم قسەکانی و شیتری دەکاتەوە:

توێژەرە سـۆڤیەتییەکان دەسـتیان بە ئەزموونەکانیان لەسـەر ئـاژەڵان کرد و بۆیـان دەرکەوت لەنێوانیـانـدا هێزێکی بەهێزی سـووسـەکردن هەیە و زمانێکی تایبەتیشـیان بۆی هەیە. ئەزموونە سـەرەتاییەکانیشـیان لەسـەر کەروێشـک بوو، ئەوەی لە دیمانەی پێشـوودا باسمان کرد کە نیشـانەیەکی بەهێزی زانستیی باشـی تێدا دەخوێنرێتەوە و دەنگوباسـیشـی بە جیهاندا بڵاو بوویەوە. هاتن و کەروێشـکێکی دایکانەیان هێنا و ئامێری لەرەلەرپێویان بەسـت لە سـەری دایکانەکە. بەچکەکانیشـیان لەناو ژێردەریاییەکدا بە درێژایی هەزاران میل دانا و یەک یەک کوشـتنیان؛ بینییان مێشـکی دایکانەکە

چەند شـــەپۆلێکی توندی پێدا تێپەڕ دەبێت. ئەوەش بەڵگەی بوونی شەپۆلی کارۆتیسی بوو لەنێوان دایکانە و بێچووەکاندا.

لە نیسانی ١٩٦٦یشدا هەستان بە ئەزموونێکی دیکە، بەڵام ئەمجارە لەســـەر مرۆڤ و ئەمیش دەنگۆیەکی فرەی لە جیهـانـدا دایەوە. ئەزموونەکە لەنێوان مۆسـکۆ و ناوچەیەکی سـیبریادا بوو لە دووری ســێ هەزار کیلۆمەتر. لەو ناوچەیە کابرایەک بەناوی (نیکۆلائیف) دانیشـــتبوو پەیامەکانی دڵی پیاوێکی مۆســکۆیی بەناوی (کامنســکی) دەخوێندەوە. شایەنی باسە نیکۆلائیف لە وەرگرتنی هەندێک پەیامدا بە هەڵەدا چوو، هەروەک چۆن لە هەندێکی دیکەیاندا بەباشـــی توانی بیخوێنێتەوە. توێژەران گەیشـتنە ئەو دەرەنجامەی سـەرکەوتنی هێزی وەرگرتنەکەی سێ هێندەی یاسای گریمانەکانە.

سەرکەوتنەکانی نیکۆلائیف لە وەرگرتنی پەیامە سووسەییەکاندا بە ڕێژەی ١٢ لە ٢٠ بوو. ئەوەش بەڵگەی هەبوونی هێزێکی بەهێزی ســـووســـەکردنە تێیدا، چونکە ئەگەر ئەو توانایەی نەبووایە، بەپێی یاسای گریمانەکان دەبوو ئەنجامەکەی ٤ لە ٢٠ بووایە. دیارە مەودای نێوان مۆسـکۆ و سـیبریا وای کردووە ڕێژەی سـەرکەوتنەکەی ١٢ لە بیست بێت؛ گەر بێتوو نزیکتر بان، ڕێژەکەش زیاتر دەبوو.

هەرچۆنێک بێت، ئەزموونەکەی نیکۆلائیف لە سەرزەمینی سۆڤیەتدا هەرای نایەوە و، ڕۆژنامەکان لێی دووان و نیکۆلائیفیشـــیان ناونا ڕادیۆی دەماخی.

یەکێـک لەوانەی قســـەی لەبـارەیەوە کردبوو وتبووی: ئەوەی نیکۆلائیف لەم بارەیەوە لە ئەزموونەکانی سـیبریادا وەدەسـتی هێناوە وام لێ دەکەن ڕای خۆم بخەمە لای ئەو ســـۆڤیەتییانەی کە دەڵێن هەموو تـاکێـک بە ڕێژەیەک لەو توانـایەی تێدایە و ئەو توانـایەش دەشێت بە مەشق پەرەی پێ بدرێت!

دوکتۆر عەلی وەردی لەبارەی هەواڵەکەی نیکۆلائیفەوە درێژە بە قسان دەدات و دەڵێت یەکێکی دیکە ئاوا تێبینیی خۆی لەسەر بابەتەکە وتووە کە خۆشـــی پســـپۆری بوواری پزیشـــکدەروونی بووە: ئەو بەڵگەیەی نیکۆلائیف لە بواری ســـووســـەکردندا خســـتوویەتییە ڕوو، ســـــوودێکی گەورەی هەیە؛ بەتـایبەتییش ئەو توانـایـانەی مرۆڤ کە هێشـتا زانسـت پەی پێ نەبردوون. زۆرجار ئێمە لە خەڵکی دەبیسـتین باسـی پەیوەندیی ســووســـەکردن دەکەن لە ڕێگەی ئیمانەوە، کەچی ئیمان هیچ دەســـتێکی لەم بووارەدا نییە. چاکترە ئێمە بە پێڕەوێکی زانسـتییانە خۆمان بخەینە ئەم مەیدانەوە و گوێ بە شـتی بێجگە ئەوە نەدەین. شـایەنی باسـیشــە ئەزموونەکەی نیکۆلائیف لەلایەن هەندێک بیرمەند و زاناوە ڕووی لێ وەرچەرخێنرا، بەتایبەت ئەوانەی مەیلێکی مادییان هەبوو. یەکێک لەوانە لە گۆڤارێکدا بەم چەشنەی نووسیوە:

"گواسـتنەوەی وێنە لە دەماخێکەوە بۆ دانەیەکی دیکە پێویسـتی بە جۆرێک شـەپۆلی کارۆتیسـی هەیە. تا ئێسـتاش دەسـتمان بەسـەر ئەو جۆرە شـەپۆلانەدا نەشـکاوە. سـەرباری ئەوەش شـتێک نییە بتوانرێت ناوی سوسەکردنی لێ بنرێت".

کاتێک نیکۆلائیف نوســـراوی ئەم دکتۆرەی خوێندەوە، تەحەددای کرد و پێی وت ئامادەی تاقیکردنەوەیەکە بە ئامادەیی دەســـتەیەک لە مـامۆســـتـایـانی زانکۆ و بڵاوکـارانی گۆڤـارەکە. ئەویش وەڵامی تەحەدداکەی دایەوە و لە شـــوێنی دیاریکراو کۆبوونەوە. نیکۆلائیف تـاقی کرایەوە و توانی بیری دوکتۆرەکە بخوێنێـــــتەوە. ئەنجـامی تاقیکردنەوەکەش، مامۆسـتاکە دانی بەوەدا نا کە لە نکۆڵیکردنی هێزی ســووســەکردندا هەڵە بووە و لە کۆتاییشـدا وتی: دەبێت زانسـتییانە لێکۆڵینەوە لەم بابەتە بکرێ.

لە دوکتۆر وەردی دەپرسین:

**له هەندێک لە قسەکانتدا وا دەردەکەوێت وتبێت: هێزی سووسەکردن لای گشت تاکێک هەیە، بەڵام هێزەکەی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێت، هەروەک چۆن هێزی زیرەکی لە کەسەکاندا جیاوازە. ئایا ئەو قسەیە تەواوە؟**

دوکتۆر: خۆی قسەکە دەڵێت: گشت تواناکانی مرۆڤ بە شێوەیەکی گشتی، چ دەرئاساکان، چ ئاساییەکان، بەپێی کەسەکان ئاستەکەشیان دەگۆڕێت. تازەییش لەڕووی زانستییەوە دەرکەوتووە پێشکەوتووانی ناو توانایەک چەشنی دوواکەوتووانی ناو هەمان توانا وان.

با ئەو قسەیەی سەرەوە کەمێک ڕوون بکەینەوە:

بۆ نموونە هێزی زیرەکیی ئاسایی تەماشاکەین کە خۆی لە زانینی شتەکان و چارەکردنی کێشەکان و دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوان شتەکاندا دەبینێتەوە. ڕێژەی زیرەکەکان لەچاو ئاساییەکاندا یەک لە سەدە. بە هەمان شێوە دواکەوتووەکانیش بە هەمان ڕێژە لەناو خەڵکیدا هەن. ئیدی زۆرینەی خەڵکی کە دەکاتە شەست لە سەد، زیرەکیی ئاساییان هەیە و دوای ئەمان ئەوانە دێن کە زیرەکییان لە سەرەوەیە. ئەوانەشی زیرەکییان لە ئاستی ئاسایی کەمترە- ئەوانەی ڕاهاتووین بە گێل یان بە زیرەک ناویان بەرین- هەر تاقمێک لەمانە پێنج لە سەدی کۆمەڵگە پێک دەهێنن.

پوختایی قسە ئەوەیە، هێزی سووسەکردنیش چەشنی هێزی زیرەکی بە هەمان شێوە و ڕێژە لە تاکێکەوە بۆ دانەیەکی دیکە دەگۆڕێت. دەبێت بیریشمان نەچێت ئەو توێژینەوانەی لەبارەی ئەم هێزەوە ئەنجام دەدرێن، هێشتا لە سەرەتای ڕێگەدان؛ ئێمەومانانیش چاوەڕێی سبەی و دووسبەی دەکەین تا ببینین توێژینەوە نوێیەکان چیمان پێ دەڵێن.

**له قســـەکانتەوە وا دەردەکەوێت ســـووســـەکردن دوو جۆر بن؛ یەکێکیان وەرگرتنی بیری دیگەرانە و ئەوی دیکەشیان سەپاندنی بیرە بەسەر دیگەراندا؛ واتە یەکێکیان ئەرێنی و ئەوی دیکەیان نەرێنییە یان وەرگر و نێرەر، بۆ رای خۆتمان پێ نالێی؟**

دوکتۆر: من وای بۆ دەچم نەک دوو جۆر، بگرە چەنـدین جۆرە. ئەمەشـم لەبەر کاریگەربوون بەو نوسـراوە وت کە لەم دوادواییانەدا لەبـارەی زیرەکییەوە خوێنـدمەوە. بیردۆزە دەروونییە نوێیەکەی لێکۆڵەری ئەمریکی، هاوارد گاردنەر، باسـی ئەوە دەکات زیرەکی هەر بەتەنهـا یەک یـان دوو جۆر نییە –وەک پێشـینـان بیریـان لێ کردبوویەوە– بەڵکوو چەندین جۆرە. من مەیلم بەلای ئەم جۆرەیاندا دەچێت لە کاتێکدا ڕەنگە سـبەی لێکۆڵەران دەری بخەن بیرۆکەیەکی هەڵەیە. هەرچۆنێک بێت، ئەو قسـەیەی تۆ کە هێزەکە بۆ ئەرێنی و نەرێنی دابەش دەکەیت، خاڵی نییە لە ڕاسـتی– ئەگەر تەواوی ڕاسـتی نەبێت. هەندێک لە توێژینەوەکانی بواری دەرئاساناسی دەریانخستووە هەندێک کەس خاوەنی هەردوو جۆرەکەن و هەشـە یەکیانی لەوی دیکە بەهێزترە.

دوکتۆر دەیداتە دەمی و دەڵێ:

بۆ نموونە نیکۆلائیف توانـایەکی گەورەی لە خوێنـدنەوەی بیری دیگەران، یـان وەرگرتنی لە مەودایەکی دوورەوە هەیە، لە کـاتێکـدا ناتوانێت پەیام بنێرێت –واتە ناردنی بیرۆکە بۆناو مێشـکی دیگەران– مەگەر زۆر بەکەمی.

بەپێچەوانەی نیکۆلائیفەوە، کەسـێکی دیکەمان دۆزییەوە لە ڕوسـیا بەناوی مۆنـان کە توانـای نـاردنی هر بیرۆکەیەکی بۆ زیهنی بەرانبەر هەیە. لەم بارەیەشـەوە هەستاوە بە هەندێک کاری سـەیر کە خاڵی نین لە جوانی.

لەوانەیە خراپ نەبێت لێرە کەمێک باسی "مۆنان"ـــیش بکەین وەک ئەوەی باسی نیکۆلائیفمان کرد. مۆنان هێزی سووسەکردی ئەرێنی لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە تێدا دەرکەوتووە و یەکێک لە کچە نزیکەکانی خۆی خەواندووە و هەندێک بیرۆکەی خستووەتە مێشکییەوە. کاتێک کچەکە بێدار بووەتەوە، بیرۆکەکانی بۆ مۆنان گێڕاوەتەوە. کاتێکیش مۆنان لێی پرسیوە چۆن ئەو شتانە دەزانیت؟ وتوویەتی: نازانم، من ئەو قسانە ئەکەم کە بە زیهنمدا دێن.

مۆنان دەستی کرد بە ڕۆیشتن بۆ باخچەکانی شاری مۆسکۆ و لەسەر کورسییەک دادەنیشت؛ هەرکەس بەوێدا تێپەڕیبایە، ئەم دەیخستە دڵییەوە وا هەست بکات ملی دەخورێت یان زەردەواڵەیەک بە ملییەوە نیشتووەتەوە.

توێژەرانی سۆڤیەت لەبارەی تواناکانی مۆنانەوە شتی زۆریان بیست و دەستیان کرد بە تاقیکردنەوە لەسەری؛ هاتن و لە ژوورێک دایاننیشاند و کەسێکی دیکەشیان لە ژوورێکی دیکە دانیشاند. مۆنان وای دەخستە دڵی کابراوە کە شتێک بەر سەری دەکەوێت یان لووتی بادەدرێت یان شتانی دیکە. کابرای بەستەزمانیش شتەکان دەهاتنە دڵییەوە و پێیان کاریگەر دەبوو. ڕێژەی کاریگەربوونەکەشی هەشتا لە سەد بوو.

**لە هەندێک لە گۆڤارەکاندا لەبارەی (میسنگ)مان خوێندەوە کە کابرایەکە لە گفتوگۆی پێشتردا باسی توانا دەرئاساکانیت کرد. ئەو توانایەکی زۆر گەورەی لە سووسەکردنی ئەرێنییدا هەیە. ئایا دەتوانیت شتێکمان لەبارەی تواناکانییەوە بۆ باس بکەیت؟ هەرچەندەی دەزانیت؟**

دوکتۆر: میسـنگ کابریەکی زۆر سـەیر و خاوەنی چەندین توانای دەرئاسـا، بەتایبەتییش توانای سـووسـەکردنی ئەرێنییدا. یەکەمین جاریش کە هێزەکەی تێدا دەرکەوت ئەو کاتە بوو تەمەنی لە دەوروبەری نۆ سـاڵییدا بوو، ئەوەش لە سـاڵی ١٩٠٨ بوو کاتێک لە ماڵەوە لە پۆڵۆنیا بەرەو بەرلین هەڵات؛ شـایەنی باسـە پارەی شـەمەندەفەرەکەی پێ نەبوو، بۆیە لەژێر یەکێک لە سـەندەلییەکاندا خۆی قاییم کردبوو. پشـکنەر هات و داوای بلیتی لێکرد و ئەویش پارچەیەک لە ڕۆژنامەی کۆنی دایە دەستی. وا خۆشی نیشان دەدا کە پشـکنەرەکە خۆی بە بلیتەکەی ئەوەوە سـەرگەرم کردووە. دوای ئەمدەسـت و ئەودەسـت کردنی کاغەزەکە، پشـکنەرەکە وتی: مادەم بلیتت پێیە بۆچی سپڕاویتە ژێر ئەو کورسییە؟ دەی هەستە سەر پێ؛ دوو کاتژمێری دیکە دەگەینە بەرلین.

لە سـاڵی ١٩٣٩، ئەو کاتەی سـەربازەکانی هیتلەر پۆڵۆنیایان داگیر کرد، میسـنگ لەوێ بوو و تەمەنیشـی گەیشـتبوویە چل. هیتلەر خێرا بڕیاری دەستگیرکردنی میسنگی دابوو. بەڵام ئەو توانی بەهۆی ئەوەی خسـتییە دڵی پاسـەوانەکانەوە بچنە ژوورەکەی خۆیان، ئەویش زۆر خێرا بەر لەوەی ئەوان پەی بەرن، توانی بۆی دەرچێت و خۆی - لەژێر سەیارەیەکی بارهەڵگردا بشارێتەوە و- بگەیەنێتە وڵاتی ڕووس.

دوای ئەوەی میسـنگ گەیشـتە ڕووسـیا، جۆزێف سـتالین هەواڵی زانی و بانگێشـتی کرد بۆلای خۆی. لەوێ بە هەندێک کاری دەرئاسـا هەستا کە ستالینی توشی سەرسوڕمان کرد. لەوێ چووبوویە یەکێک لە بانکەکانەوە و کاغەزێکی سـپی پێشـکەشـی خەزنەدار کردبوو و واشی خستبوویە دڵییەوە کە ئەمە چەکێکە بە بەهای ١٠٠ هەزار ڕۆبڵ و دەیەوێ ئەو بڕە ڕاکێشـێت؛ خەزنەداریش دوای تەماشـاکردنی کاغەزەکە، بڕە پارەکەی ڕاکێشابوو و دابوویە دەستی میتسـنگ و ئاو بێنە و دەسـت بشـۆ. دوای تاقیکردنەوەکە، میتسـنگ بڕە پارەکەی

هێنایەوە بۆ بانک و دابوویەوە دەستی خەزنەدار، کەچی ئەو وەری نەگرتبوویەوە تا ئەوەی ئەمجارەیان تەماشای کاغەزەکەی کردبوویەوە کە سپی سپییە. ئا لەو دەمەدا شڵەژابوو و کەوتبوویە سەر زەوی!

میتسنگ لە مۆسکۆ بە تاقیکردنەوەیەکی دیکەشی کردبوو؛ ئەویش: ستالین داوای لێ کردبوو بچێتە بینایەکی دەوڵەت. فەرمانیشی بە پاسەوانەکان کردبوو نەهێڵن لە بیناکە بچێتە دەرەوە؛ کەچی میسنگ توانی بەناویاندا تێپەڕێت دوای ئەوەی خستبوویە دڵیانەوە کە ئەم بەڕێز (بیریا)یە، بەرپرسێکی نهێنیی پۆلیسی سۆڤیەتییە و ئەوانیش بەو شێوەیە سڵاویان لێ کردبوو کە هەمیشە لە بەڕێز بیریایان دەکرد.

## سودی کردەیی و زانستیی لە خوێندنی ژیانی میسنگ و هەر کەسێکی خاوەن توانای دەرئاسا چییە؟

دوکتۆر: خوێندنی ژیاننامەی میسنگ وەک خوێندنی ژیاننامەی هەر بلیمەتێکی زانست و هونەر یارمەتیمان دەدات لە تواناکانی مرۆڤ بگەین و بشزانین چۆن وەبەرهێنانیان تێدا بکەین لە ژیاندا.

گرنگیی میسنگ لە سووسەکردندا چەشنی گرنگیی نیوتن لە بواری فیزیا و ئەنیشتاین لە بیرکاری و ئەدیسۆن لە داهێنان و موتەنەببی لە شیعر و خەلدوون لە مێژوو و کۆمەڵناسییدا وایە. ئەمانە تاقانە و دەگمەنن و یەک دانە لەمانە لەناو سەدان ملیۆندا هەڵدەکەون؛ بەڵام لە هەمان کاتیشدا وێنەیەکی نموونەییمان لە مرۆڤ دەدەنێ کە خاوەنی چ توانا و هێزێکی هەمەچەشنە!

ئەمە بارودۆخی گشت توانا و بەهرەکانە لە مرۆڤدا. کەسێک هەیە خاوەنی بەهرەیەکی گەورەیە و زۆر لە سەرەوەیە، لەخوار ئەمە

کەسێک هەیە لە بەهرەکەدا کەمێک خوارترە و پلە بە پلە وەرە خوارەوە. دەتوانین بۆ هێزی سووسەکردنیش هەمان قسە بکەینەوە. هەموو کەسێک برێک لەو توانایەی تێدایە؛ زۆرینەی خەڵکییش لە دۆخێکی مامناوەندییدان، هەروەک چۆن لە زیرەکییشدا مامناوەندن. ئیدی کەسانی سەرووتری وەک میسنگ هەیە و کەسانی لەخوارووتریش.

وا دەردەکەوێت هەرکەسێک هێزە سووسەییەکەی لە ژیانی ئاسایی خۆیدا لە بوارە جیاوازەکاندا بەکار دەهێنێت بەبێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن. بۆ نموونە تەماشای هەندێک بازرگانی سەرکەوتوو بکە؛ دێن و هێزە سووسەییەکانیان لە خوێندنەوەی مێشکی کڕیارەکانیاندا بەکار دەهێنن، یان بۆ پێوتنی ئەو شتانەی حەزیان لێیەتی. ئەوان ئەم کارە خۆبەخۆ دەکەن، بەبێ هیچ ویست و خواستێکی خۆ بۆ ئامادەکراو. ئەگەر خۆیان بەمە بزانن، ڕەنگە دۆخەکەیان لەکیس بچێت یان لەبری سوود، بەسەر خۆیاندا قوڵپی بکەنەوە. چونکە توانا نەستییەکان لەلایەن هۆش و بیرکردنەوەی لۆژیکییەوە لەناو دەبرێن.

یەکێک لە بازرگانە سەرکەوتووەکانی بەغدا بۆی گێڕامەوە کە دەتوانێت سووسەی دڵی هەرکام لە کڕیارە نوێیەکانی بکات کە دێنە نوسینگەکەیەوە کە ئایا فێڵاوییە یان پاک و چاکە؟ ئایا بەتەمایە مامەڵەکە ڕێک بکەوێت یان پەکی بخات و لێی دوودڵە؟ پێشی وتم: سووسەکردنەکانی تا ڕێژەی نەوەد لە سەد لەگەڵیدا ڕاستگۆ بوون.

وای بۆ دەچم، هێزی سووسەکردن و دڵخوێندنەوە بە هەردوو جۆرە ئەرێنی و نەرێنییەکەیەوە، پەیوەندی بەو شتەوە هەبێت کە خەڵک ناوی لێ ناوە (بەخت)؛ ئێمە کەسانێک دەبینین لە ژیاندا سەرکەوتوو دەبن، بەبێ هیچ هۆکارێکی دیار کە هەندێکیان ئاستی زیرەکییشیان تا ڕاددەیەکی باش لەخوارەوەیە. لەوانەیە هێزە

سووسەییەکەیان لەکاتی مامەڵەکاندا بەبێ ئەوەی خۆیان هەست پێ بکەن و بزانن، بەکار بهێنن. خەڵکیش ڕاهاتوون ئەو جۆرە سەرکەوتنە بە بەخت و ئیقباڵ ناو بەرن، چونکە هیچ هۆیەکی ئاشکرای بۆ نادۆزنەوە. پەندێکی باو لە بازارەکانی بەغدادا هەیە ناوەڕۆکەکەی دەڵێت: بازرگان کە دەچێتە بازاڕ، پێویستە عەقڵی لەسەر ڕەفەیەکدا دابنێت. ئەوان مەبەستیان لەوەیە: بازرگان نابێت عەقڵی ئاگای لۆژیکی لە مامەڵەکاندا بەکار بهێنێت، بەڵکوو بەپێی ختوورەکان بڕوات کە هێنە دڵییەوە و بیری لێ نەکردوونەتەوە.

ڕاستە ئەگەر بڵێم: زیرەکیی لۆژیکی لە هەندێک کاتدا توانای سووسەکردن خراپ دەکات. کەسانێک دەبینین لە خوێندنی قوتابخانە سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە، بەڵام دواتر لە بازاڕدا سەرکەوتوو بوون؛ هەروەک چۆن کەسانێکیشمان بینیوە لە خوێندندا سەرکەوتوو و لە بازاڕ سەرنەکەوتوو بوون.

گوێمان لە چیرۆکی بازرگانێکی سەرکەوتووی خاوەن ماڵ و موڵک دەبێت کە لە بازرگانییەکەیدا زۆر پێشکەوتووە، کەچی لە کاتی قسەکردندا فڵتەفڵت هیچی لێ تێناگەیت. سەرمان سووڕ دەمێنێت کە ئایا چلۆن ئەم کەسە بەم بێ دەم و زمانییەوە ئاوا لە بازرگانییدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. بیری ئەوەمان نییە ئەگەر بەدەم و زمان بووایە، لەوانەیە لە بازرگانییەکەیدا قازانج سەری مایەشی خواردبا چونکە بەهرەی بازرگانی جیاوازە لە بەهرەی زانست؛ هەرکام بواری تایبەت بە خۆیانیان هەیە.

**کەمێک بەر لە ئێستا، خۆتت لە بواری سووسەکردندا بە میسنگ بەراورد کرد و وتت ئەو لەم بوارەدا دەستێکی باڵای هەیە لەکاتێکدا خۆت زۆر لەدواوەیت. هۆی چییە وا دەڵێیت:**

دوکتۆر: کێشـــەی من هەر لە منداڵییەوە وەک هاوڕێکانم خراومەتە بەر خوێندن و ئاستیشم تێیدا باش بوو، کەچی خانەوادەکەم خوا لێیان خۆش بێت، هێنامیانە دەرەوە و خستمیانە بازاڕ کە ئێرە شوێنی باسی ئەوە نییە. بازاریش سەرنەکەوتن دوای سەرنەکەوتنی بۆ تۆمار کردم و لە کۆتـاییـدا گەیشـــتمە ئەو دەرەنجـامەی: من هیچ بەهرەیەکی بـازرگانیم تێدا نییە. من توانـای خوێندنەوەی بیری کڕیـارەکانم نییە، هەروەک چۆن ناشتوانم کاریگەریی لەسەر بیرکردنەوەیان جێ بهێڵم. کڕیارەکانم هێشـــتا بەتەواوی نەدەهاتنە ژوورەوە، خێرا پشــــتیان هەڵدەکرد و دەچوونە لای هاوســێکەم. لە کۆتاییدا قەدەر یارمەتی دام لە ڕێگەی خوێنـدنی ئێوارانەوە بگەڕێمەوە قوتـابخـانە و لە ســــایەی خوداوە سەرکەوتووش بووم.

## هەڵدانی جونەیهـ بە ئاسماندا و کەوتنەخوارەوەی میوەی هەمەجۆر

(التضامن ٢٧/ ٢/ ١٩٨٧، ژمارە ٢٠٠)

زنجیرەی (الحدیث الخمس) کە لە ژمارەکانی پێشـــودا لەبارەی (دەرئاساناسیی هاوچەرخ)ـەوە بڵاومان کردەوە، لای هەندێک خوێنەر بوویە مـایەی هەڵا و لەلایەن هەنـدێکیـانەوە نـامەی پشـــتگیری و وەڕاســـتزانین، لەلایەن هەندێکیشـــیانەوە نامەی ناکۆکی و ڕەخنە و بەرتەکدانەوەمان پێ گەیشت.

چەند نامەیەکیشـمان لە خوێنەرانی وڵاتی میسـرەوە پێ گەیشـتووە کە لەبارەی ڕاستیی چیرۆکی دەرئاسای ئەو کابرایەوە دەپرسن کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا ژیاوە و ناویشی سەلیم طەهطاوی بووە!

بۆ جاری شەشەم ماجید سامەڕائی گەیشت بە دوکتۆر تا لەبارەی ئەو کەسـایەتییە سـەیرەوە قسـەی لەگەڵ بکات کە کارەکانی هی ئەوە نین بڕوایان پێ بکرێت.

لە دوکتۆر وەردی دەپرسین: مادەم بەدواداچوون بۆ دەرئاساکانی مرۆڤ دەکەیت، ئەوا دەبێت شـتێک لەبارەی سـەلیم طەهطاوییشـەوە بزانیت... چی لەبارەوە دەزانیت و ڕات لەبارەی کارە دەرئاساکانییەوە چییە؟

دوکتۆر: ئەم پیـاوە مـاوەیەکی زۆرە وەفـاتی کردووە، کەچی هێشـــتاش خەڵک باســـی خۆیی و کارە دەرئاســـاکانی دەکەن. ڕۆژنامەکانیش ماوە ماوە باسـێکی دەکەن. خۆم لەمیسـر بووم کاتێک مشـتومڕ کەوتە نێوان نووسـەرە یار و نەیارەکانییەوە. منیش هەوڵم دا بەقەد توانای خۆم لێی بکۆڵمەوە و لە بەتەمەنانم لەبارەیەوە پرسـی و ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەش کە هەبوون، خوێندنمەوە.

هیوام وایە کتێبێکی تـایبەت لەبـارەی ئەو پیـاوەوە دەرچێـت، هەروەک چۆن لەبارەی ڕاسـپۆتینی ڕوسـی و هۆمی سـکۆتلەندی و هۆدینی ئەمریکیی و بێجگە ئەمانەوە دەرچووە.

دەتوان ئەوەی لەبارەی میسـنگەوە گوتم، بۆ شـێخ سـەلیمیش بیڵێمەوە. لە دیدگای مندا نوێنەرایەتیی دۆخێکی تایبەتی دەرئاسـا دەکات کە زانسـتی دەرئاسـاناسـیی هاوچەرخ لێی دەکۆڵێتەوە. بەڵام بەداخەوە دەبینم هەندێک لە ڕۆشـنبیرەکانی لای خۆمان هێشـتاش بەچاوی نکۆڵی یان خۆگەورەترگرتنەوە تەماشـای ئەم بابەتە دەکەن، هەر بەو شێوەیەی بەر لە نیو سەدە کردیان. ئەوەتا سەردەم گۆڕاوە و لەگەڵیشـیدا پێڕەوی بیرکردنەوە. کەچی ئەوان لە بیرکردنەوەیاندا هەر ئەوەتان لەسەر پێڕەوەکەی جاری جارانیان.

دوکتۆر وەردی کەمێک پشووی دا و ئەوسا دەستی پێ کردەوە.

شێخ سەلیم طەهطاوی لە هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لەدایک بووە. باوکی ناوی بدرالدین) بوو. لە سـەرزەمینی حیجازەوە بەرەو میسر کۆچی کردووە و لە ئاواییەک بەناوی (جەرجا) باری خستووە. ئەدی لەوێش شێخ سەلیم هاتووەتە دنیا. باوک لە ساڵی ١٩٠١ وەفات دەکات؛ شـێخ سـەلیمیش ناچار ئەوێ تەرک دەکات و ملی ڕێگەی "سـوهـاج" دەگرێت. بەڵام لەوێ وەک تێکڕای خەڵکی لە خـانوودا نیشتەجێ نەبوو، بەڵکوو لە گۆڕستان ژیا. زۆربەی کاتەکانیشی ڕوت و قووت بوو، لەو خواردنەشـی دەخوارد کە خەڵکـان دەهـاتنە سـەرقەبران و دەیاندایە یان تۆزقەڵە پارەیەکیان پێ دەبەخشـی. ئەو داوای لە خەڵکی نەدەکرد، کاتێکیش شتێکیان پێ دەدا، تەنها ئەوەندەی هەڵدەگرت کە بەسـی بوو. زۆرینەی کاتەکانی لە نوێژ و تاریفکردنی خودادا بەسـەر دەبرد. عەبدوڵلا وەهبی پاشـا پێی زانی کە دەکاتە باوکی نیاروانی بەناوبانگی میسری، یوسف وەهبی. شتانێکی دەرئاسا و سـەرسـامکەری لێ بینی؛ ئەبلەق بوو، ئیدی پەیوەندییەکانی لەگەڵ

پەو کرد. کاتێکیش عەبدوڵلا وەهبی پاشـا لە قاهیرە نیشـتەجێ بوو، شـێخ سـەلیم ماوە نا ماوەیەک لە سـوهاجەوە دەهاتە سـەردانی. لە کۆتاییدا پاشا داوای لە شێخ سـەلیم کرد گۆڕستان تەرک بکات و لەو ئۆتاقەدا نیشـتەجێ ببێت کە لە کۆشـکی پاشـادا بۆی تەرخان کراوە. شێخ سەلیمیش داواکە پەسەند دەکات و لەو ئۆتاقەدا دەسرەوێ. ئەو ڕۆژانە یوسـف وەهبی منداڵ یان مێرمنداڵ بوو. هەلی بۆ ڕەخسـابوو زۆرێک لە کارەکانی شـێخ سـەلیم ببینێت. ئیدی لە گەورەیی خۆیدا و پاش وەفاتی شـێخ سـەلیم، دەسـتی بە باس و خواسـی تواناکانی کردبوو. کارەکانی شێخ سەلیم هەمەچەشن و دەرئاسا بوون. خەڵکی ناوچەی نزیک گۆڕسـتانەکە دەماوەم شتیان لێ دەگێڕایەوە. دواتریش کارەکانییان دەگێڕایەوە کە هاتبوویە قاهیرە و لەوێ سرەوتبوو.

بەڵام گرنگترین شت قسەکانی یوسف وەهبییە کە ماوەیەکی نەکەم لەگەڵیدا ژیاوە.

دوکتۆر وەردی بەردەوامە لە گێڕانەوە:

یوسف وەهبی هەمیشە لە باسی منداڵی و مێردمناڵیی خۆیدا یادی شـێخ سـەلیمیشـی دەکردەوە. لە سـاڵی ١٩٥٤، یوسـف وەهبی چەند زنجیرەیەک لە یاداشتەکانی خۆی لە گۆڤاری (أهل الفن)ـــی قاهیرەدا نوسی. لە ژمارەی ٢٤ــی ئایاریشدا یادێکی شێخ سەلیمی کرد و دەقی نوسراوەکەشی ئاوەها بوو:

بە گەمژە و حەپۆل و ساویلکەی "ئیماندار بە ئەفسانە" ناوم براوە، بەڵام ئەوانە نە ئەفسـانە، نە وەهـم و نە تـوڕڕەهـاتـن. ئەوانە گەلەڕاستییەکن هەزاران کەسی سەردەمی شێخ خۆیان شایەتی بوون. هەموو خەڵکی صـەعید (ناوچەی گۆڕسـتانەکە) و گەورە زانایانی میصـر بڕوایـان پێ کردبوو. ئەو پیـاوە توانـایەکی تەواوەتی لە کەویکردنی جنۆکەدا هەبوو، چی پێویسـت بوایە بۆیان سـاز و تەیار دەکرد. لە هەمان کاتیشدا ئیماندارێک بوو تا دوا ڕاددەی ئیمانداربوون.

موسـولمانێک هیچ فەرزێکی لەدەسـت نەدەچوو؛ هەموو چرکەسـاتێک سـتایش و تـاریفی خودای دەکرد و هیچیشـی لە خوێندەواری نەدەزانی).

ئەم وتارە بوویە مایەی تورەبوونی هەندێک نوسـەری میسـری و بەتایبەتییش نوسـەری بەناوبانگ "سـەلامە موسـا". ئەم نووسـەرە وتەیەکی لە ڕۆژنامەی (الأخبار) لە ٣٠ی ئایاری ١٩٥٤دا بە ناونیشانی (شـەللاقکاریی یوسـف وەهبی) و تێیدا داوای کردبوو پەنجا یان سـەد شـەللاق لە یوسـف وەهبی بەهۆی بڵاوکردنەوە خورافات لەنێو گەل و نیشتماندا بدرێت.

لە ساڵی ١٩٧٢شدا یوسف وەهبی وتەیەکی دیکەی لە یاداشتەکانی بڵاو کردەوە کە تایبەت بوو بە شـێخ سـەلیم و لە ڕۆژنامەی (آخر سـاعة)، ١٩ـی تەمووزدا بڵاو کردەوە و لە کۆتاییەکەیدا دەقاودەق ئاوەهای نوسیوە:

(مەبەستم گومڕاکردن نەبووە و یارمەتیشم لە خەیاڵ وەرنەگرتووە بۆ ڕێکخسـتنی شـتەکان و واشـم لە عەقڵەکان نەکردووە بەزۆر بڕوا بەم دیاردانە بهێنن. بەڵکوو تاکە مەبەسـت و مرازی دڵم ئەوەیە زانا و بیرمەندانێک پەیدا ببن بتوانن شـیکارییەکی دروسـتی دیاردەکە بکەن. ئێسـتەکانێ لە ئەورووپا کۆڕی تایبەت دەگیرێت بە ئامادەیی زانا و ڕۆشـنبیرەکان بۆ ئەوەی خۆیان شـایەتی ئەوە بن کە شـێخ سـەلیم دەیکات، بەڵام لە سـنوورێکی دیاریکراوتردا. هێشـتاش دەڵێم خودا زاناترە و هەر ئەوە هەڵە ناکات، بۆیە بەرد و قووڕ بارانم مەکەن).

**ئایا دەکرێ شتێ لە دەرئاساکانی شێخ سەلیمان بۆ بگێڕییەوە تا لە سروشتەکەی تێبگەین؟**

دوکتۆر: وەک پێشـــتریش ئاماژەم بۆ کرد، دەرئاســـاکانی شـــێخ سـەلیم زۆر و هەمەچەشـن بوون. هێندە بەسـە سـێ دانەیان لە زاری یوسف وەهبییەوە بگێڕینەوە.

## چیرۆکی یەکەم:

ئەمەیان لە کۆشـکی عەبدوڵڵا وەهبی پاشـا لە قاهیرە ڕووی داوە کە دەکاتە باوکی یوســف وەهبی -وەک کەمێک لەمەوبەر ئاماژەی بۆ کرا. پاشـــا ســـیاســـەتمەدار و پیاوانی ئایینی و شـــاعیر و هۆنەرانی بانگێشـتی کۆشـک کردبوو تا شـێوێک پێکەوە بخۆن و شـایەتی کارە دەرئاســاکانی شـێخ ســەلیمیش بن. کاتێک شـێو تەواو خورا، پاشـا ســەری هێنایە لای گوێچکەی شـــێخ ســـەلیم و پێی وت تووشـــی عەیبەیەک بووە و ئەو دەتوانێت دەربازی بکات لەو عەیبەیە؛ ئەویش ئەوەبوو خزمەتکـارەکـان بیریـان چووبوو میوە بکڕن و ئەم دەبوو پینەی ئەو وەزعە بکات. شێخ سەلیمیش داوای جونەیهێکی لێ کرد کە پارەی میسرییە. تۆزێکی ئەمدیودیو کرد و دواتر هەڵیدا بە حەوادا. لە چرکەساتێکدا کۆمەڵێک میوە بەربوونەوە سەر خوان (سفرە)ـــەکە و ئامادەبووانی ئەبڵەق کرد. یەکێک لە ئامادەبووان قیڕاندی و شـــێخی بەوە تۆمەتبار کرد کە جنۆکە بەکار دەهێنێت و کابرایەکی ســـووکە. شـێخ لەم قسـەیە دڵی گەردی گرت وخراپ تووڕە بوو. شـێخ هاواری کرد (ئادەی لێ بدەن)، کابرا بە پشـــتدا کەوت و هەســـتی دەکرد بە کوتەکێکی شـاراوە کوتەککاری دەکرێت و تکا و لاڵەی لە پاشـا دەکرد تا بە شێخ سەلیم بڵێت بەسە لێی نەدات. پاشاش داوای لە شێخ سەلیم کرد ڕێگری بکات لەو کوتەککارییە. ئەویش کردی و ئینجا هۆڵەکەی جێهێشـت. ئەوسـا ئامادەبووان گەیشـتنە هاواری کابرا و دەسـتیان خستە ژێر باڵی و هەڵیان ستاندەوە.

### چیرۆکی دووهەم:

لەو شەمەندەفەرەدا قەوما کە لە صەعیدەوە بەرەو قاهیرە دەهات. کات: بیستەکانی ئەم سەدەیە (واتە سەدەی بیستەم)، لە دەورانی پاشایەتیی موحەممەد مەحموود پاشا. سەرۆکوەزیران سواری فارگۆنێکی شەمەندەفەری تایبەت بە خۆی ببوو، هەواڵی بیستبوو کە شێخ سەلیمیش لەو شەمەندەفەرەدایە.

لەو سەردەمەدا شێخ سەلیم ناوبانگی داخستبوو و، دەچوویە هەر شوێنێک دەبوویە دەنگوباس. سەرۆکوەزیرانیش مەیلی بوو بانگی بکاتە فارگۆنەکەی خۆی تا کەمێکی بدوێنێ؛ شێخیش هات. کاتێک وەختی خواردن هات، چێشتێک هێنرایە بەردەستی سەرۆکوەزیرانەوە کە گۆشتی کوڵیوی تێدابوو. سەرۆک وای نیشاندا گۆشتەکە باش نییە، بۆیە داوای لە شێخ کرد لە ڕێگەی جنۆکەکانەوە گۆشتێکی خۆشی بۆ بهێنێت. شێخ لێی پرسی لە چ چێشتخانەیەکی قاهیرەوە حەزی لێیە بیگاتێ؟ سەرۆک ناوی چێشتخانەی (فلاش)ی برد کە ئەوسا ناوی لە دیواندا بوو. شێخ داوای نرخی گۆشتەکەی لە سەرۆک کرد، ئەویش جونەیهێکی تەڵای دایە؛ شێخیش جونەیهەکەی لە پەنجەرەوە هاویشت و پاش کەمێک دەستی لێوە بردە دەرەوە و بابۆڵەیەکی گۆشتی لەسەر سینی بە چەتاڵ و چەقۆوە خستە بەردەستی...

دوکتۆر عەلی وەردی درێژە بە باسەکە دەدات:

### چیرۆکی سێهەم:

لە شەقامی موسکی لە قاهیرە و لە دووکانی کابرایەکی جەواهیرفرۆشی یۆنانییدا ڕوویداوە. یوسف وەهبی و دو براکەی موحەممەد و مەحموود و شێخ سەلیم هاتوون بۆ سەردانی. شێخ سەلیم ویستی شێتک بکات، بۆیە دەستی برد بۆ ئەنگوستیلەیەک کە

نقيمێكی ياقووتی بەسـەرەوە بوو و پرسـياری نرخەكەيی لێ كرد، خاوەنەكەشی وتی: شەش جونەيهـ شێخيش يەک جونەيهی دايە؛ كابرا تووڕە بوو و موستيلەكەی هەڵگرتەوە و خستييەوە نێو نمايشگاكە و دەرگاكەشی بە كليل داخست، كەچی موسيلەكە هاتەوە دەستی شێخ؛ هەمديس خاوەنموڵک وەری گرتەوە و خستييەوە شوێنی خۆی، ئەويش هەمديس هاتەوە دەستی شێخ. كابرا هاواری كرد و پۆليسی بانگ كرد و ئەو حەشاماتە هەموو بۆ سەيری بەزمی شێخ خڕ بوونەوە.

كەچی ئەنگوستيلەكە لە دەستی شێخدا ون بوو. شێخ بە پۆليسەكەی وت: موستيلەكە لە باخەڵی تۆدايە، پۆليس دەستی بە گيرفانيدا كرد و لەناو قيژە و هاواری خەڵكدا دۆزييەوە. پۆليس نووڕايەوە تا دەستی شێخ ماچ بكا. ئەوسا خەڵكەكە هوتافيان دەكێشا و داوای بەرەكەت و فەڕيان لە جەنابی شێخ دەكرد. گەوهەرفرۆشيش دەستی بە گرين كرد و داوای عەفووی لە شێخ كرد. ئەو دەمەشی شێخ لەگەڵ يوسف و دوو براكەيدا سواری گاليسكەكە بوو، خەڵكەكە دوايان كەوتن و هاواريان دەكرد (وەلی، وەلی، وەليی خودا).

**ڕێگەم بدە بڵێم: ئەو چيرۆكانەی جەنابت گێڕاتنەوە، ناچنە ئەقڵمەوە و ناتوانم بڕوايان پێ بكەم و زياتريش مەيلم بەلای ڕايەكەی سەلامە موسادا دەچێت كە يوسف وەهبی تاوانبار كردبوو بەوەی خورافە و شتانی هەڵبەست پەڵيت لەناو مەردوومدا بلاو دەكاتەوە. ئيدی نازانم هەڵوێستت دەربارەی من و ئەو چيرۆكانەش چييە؟**

دوكتۆر: هەقی خۆتە وا بڵێيت؛ منيش ئەو كاتەی بۆ يەكمجار گوێم لەو چيرۆكانە بوو وەک تۆ بووم، تا ئەوەی دواتر زانيم لە جيهاندا كەسانی ديكەش هەن تواناكانيان هيچی كەمتر نييە لەمانەی شێخ سەليم. زانايان هاتن و لێيان كۆڵينەوە و سەرەنجام توشی سەرسامی

بوون چونکه له لایەکەوه نەیاندەتوانی بەدرۆی بزانن چونکه بەچاوی خۆیان بینیویانه، لەولاشـــەوه بڕوایان پێ نەدەکرد چونکه له عەقڵیاندا جێگەی نەدەبوویەوه، واته تەفسیر و ڕاڤه نەدەکرا.

هەڵوێســـتی زانســـت دەرهەق بەم دەرئاســـاناســـییه له ســـەدەی بیســـتەمدا زۆر جیاوازە له هەڵوێســـتی ســـەدەی نۆزدەهەمی. ســـەدەی نۆزدەهەم ســـەدەی لەخۆباییبوونی زانســـت بوو؛ زانایان بەهۆی گشـــته دۆزینەوه گەردوونییەوه، له کەوڵی خۆیان چووبوونه دەرێ. خەیاڵیان دەکرد کە له گشت هەمەکییەکان (کلیات)ـــی گەردوون تێگەیشتوون. شـــتێکی ئەوتۆی نـــاڕوون نەمـــاتەوه مەگەر چەنـــد وردەکـــارییەکی هەندەکی و هەر لەم سۆنگەیەشـــەوه پەلەیان بوو له بەدرۆخستنەوەی هەر دیاردەیەک کە له زانســـته ســـووردارەکەی خۆیان بەدەر بووایه! چەشـــنی ئەو قوتابییەیان لێ هاتبوو کە بنەماکانی زانســـتێک دەخوێنێت و ئیدی وا دەزانێت گشت زانستەکه فێر بووه و دەتوانێت بڕیاری تێدا بدات.

بۆخنەر[*] له نیوەی ســـەدەی نۆزدەهەمدا هات و گوتەزایەکی خسته دیوانەوه و لەوســـاوه ئەو گوتەزایەی بووەته دەســـتووری زانایان و ناتوانن بە هیچ کلۆجێک -لە بیرکردنەوەیاندا- لێی لادەن، ئەویش: "له گەردووندا بێجگه مادده و جووڵه شـــتێکی دیکه نییه".مانای ئەوەش: ئەو یـــاســـــایـــانەی مـــادده و جووڵه هەڵـــدەســـــوڕێنن و ئێمه لەم ســــنووردارییەی خۆماندا تێبینییان دەکەین، هەر ئەوانەن کە گشـــت جیهان هەڵدەســـوڕێنن و هەر شـــتێکی ناکۆک بێت لەگەڵ ئەمانەدا، بێ شک نازانستی و ئاوەزناپەسەندە.

گوتەزاکەی بوخنەر تا کۆتاییەکانی ئەو ســـــەدەیه و بەراییەکانی ســـەدەی بیســـتەمیش هەر بەســـەر زانایاندا زاڵ بوو؛ ئیدی لەو ماوەیەدا ئەتۆم و تیشـــک و بیردۆزی کوانتەم و ڕێژەیی و شـــتانی دیکه هاتنه گۆڕێ... زانایان هۆشـــیان وەبەردا هاتەوه و تێگەیشـــتن کە بەتەنها

مادده و جووڵە فەرمانڕەوای جیهان نین؛ بەڵکوو ســـەرڕێژە لە نێهنی کە بە گوتەزاکەی[12] بۆخنەر ڕاڤە نـاکرێن. هەرگا ســـوچی نهێنییەک دەردەخەن، دنیایەک نهێنی ئاڵۆزتریان لێ دەردەکەوێت.

لەمڕۆدا زانایان کاتێک هەواڵی دەرئاسایەکی لەم شێوەیە دەبیستن لەمەی شـێخ سـەلیم، خێرا دژی ڕاناوەسـتنەوە و بەدرۆی ناخەنەوە، بەڵکوو هەوڵ دەدەن خوێندنەوەیەکی بابەتییانەی بێلایەنانەی بۆ بکەن؛ ئیدی دۆزینەوەی هۆی ئەم دەرئاسایانەش دەخەنە ئەو کات و ڕۆژەی کە زانست پێی دەگات و قسەی خۆی تێدا دەکات.

دوکتۆر وەردی درێژە بە بابەتەکە دەدات و دەڵێت:

زانسـت هەر لە پەرەسـەندنی بەردەوامدایە. ئەو شـتەی ئەوسـا زانسـت بە ئەسـتەمی دەزانی، ئێسـتا کەوتووەتە بـازنەی لواو (ممکن)ــەکانەوە. ئەگەر بە کەسـێکی سـەدەی هەژدەمان بگوتایە: ئـامێرێـک دێـت لە دووری هەزاران میلەوە وێنەی ڕووداوەکـان بە ڕەنگاوڕەنگ (ملون)ــی دەگوێزێتەوە، هەرگیز بڕوای بە قسـەکانمان نەدەکرد. ڕەنگە قسەکەشمانی بە گەمە یان مەسخەرە دەهاتە بەرگوێ. کەچی ئێستا ئەو ئامێرە یەکێکە لە بەڵگەنەویستەکانی نێو ژیانمان.

لە کتێبی نوسەرێکی عەرەبیی سەدەی سیانزەهەمدا خوێندمەوە کە پێشـەنگی سـەردەمەکەی خۆی بووە. بینیم ئەو ئەسـتەمانە دەژمێرێت کە لە هیچ کات و شـوێنێکدا عەقڵی مرۆڤ قەبووڵیان ناکات. یەکێک لەوانە: لە ڕۆژهەڵات گوێبیسـتی دەنگێکی ڕۆژئاوا بیت. کاتێک ئەوەم خوێندەوە، ئاواتم خواسـت نوسـەرەکە زیندوو ببوایەتەوە و گوێی لەو دەنگە بگرتایە لە بەغداوە دەردەچێت و دەگاتە ئەمریکا وەک ئەوەی کابرا لەگەڵ کەسی تەنیشت خۆیدا قسە بکات.

---

[12] - گوتەزا: مەقولە: category

لە سـالّی ڕابردوودا لە یەکێتیی سـۆڤیەت تاقیکردنەوەیەک ئەنجام درا، وا هەسـت دەکەم تیشـکێکیشـی خسـتە سـەر دەرئاسـاکانی شـێخ سـەلیم و هاوپیشـەکانی. توێژەرەکان دوو کەسـیان هێنا کە خاوەنی هێزێکی گەورەی ئەرێنی و نەرێنیی سـووسـەکردن بوون و یەکێکیان لە مۆسکۆ و ئەوی دیکەشیان لە لینینگراد دانا. داوایان لەوەی لینینگراد کرد چەند شـەپۆلێک بنێرت بۆ ئەوەی مۆسکۆ. ئەوەی مۆسـکۆ گیانی لەتاو ئەو شـەپۆلە بەهێزانە کەوتە ژان و هاوارکردن. دوای کەمێک دۆخەکە پێچەوانە بوویەوە و ئەمی دیکەیـان شـەپۆلی بۆ ئەوەی مۆسـکۆ نارد و ئەمجارە ئەو لەتاو ئازار پێچی دەخوارد وەک ئەوەی جێگە مشتی یەکتریان لەسـەر ڕوومەت دەبینرا وەک بڵێی کە شـەڕی دەستەوئێخە کرابێت.

یەکێک لە توێژەرەکان بەناوی دوکتۆر ئێدوارد فۆمۆ هاواری لێ بەرزبـوویەوە و وتـی: (ئەمەی دەیـبـیـنـین لەسـەروو گشـت خەیاڵاتێکەوەیە).

**ئەوەی سـەرنجی ڕاکێشـام ئەو وەسـفەی یوسـف وەهبی بوو بۆ شـێخ سـەلیم کە توانای ڕەهای لە ڕامهێنانی "پەری"دا هەیە و چی گەرەک بێ بۆی ئامادە ئەکەن و فەرمانی یەک چرکە دوا ناخەن. ئەم قسەیەی یوسف وەهبی دەمانکێشێتە نێو بابەتی جنۆکە و ئەو خورافە بێ بنەتایانەی پێوەی گرێ دراون. ئەوجا ڕای جەنابت لەم بارەیەوە؟**

دوکتۆر: ئێمە دەبێت قسـەکانی یوسـف وەهبی وەک گێڕەرەوەیەک وەرگرین نەک وەک توێژەرێک. جیاوازییەکی زل لەنێوان گێڕەرەوە و توێژەردا هەیە کە نابێ تێکەڵ بکرێن.

ئەو کاتەی یوسـف وەهبی شـتەکە دەباتەوە سـەر پەری و جنۆکە، ئەوە ئەو بە زمانی ڕەشـەخەڵکی میسـر دەدوێت. ڕاسـتییەکەشـی

ڕەشـەخەڵکی میسر هەر وەک ڕەشـەخەڵکی عێراق وایە. ڕەشـەخەڵکی میسر وەک هی هەموو سەردەم و شوێنێک بابەتە سەیرەکان دەپێچنە ئەو چەمـک و زاراوە خوپێوەگیراو و سـنوورە دیـاریکراوەی زانیارییەوە کە هەیانە. بۆیە لە وڵاتە ڕۆژهەڵاتییەکان ڕاهاتوون هەر شتێکی سەیر ڕوویدات، دەیپێچن بە کاری جنۆکەوە.

ڕاسـتە ئەگەر بڵێم: بیرۆکەی جنۆکە لە دێر زەمانەوە لەناو مرۆڤدا سـەری هەڵداوە؛ هەر لەو کاتەی کەسـانی چەشـنی شـێخ سـەلیم کاری سـەیروسـەمەرەیان لەدەسـت بینراوە. کاتێک بینیویانە کەسـێک لە ڕێگەی هەواییەوە ئەو شـتەی دەیهەوێت دێتە بەردەسـتی؛ یان بەبێ ئامرازێکی دیار، دەکەوێتە وێزەی کەسێک و باش باشی فەلاقە دەکات، بێ گومان دەبێت وای حسـاب بکەن کەسـانێکی نەبینراو ئەو کارە دەکەن.

نـابێت بیریشـمـان بچێت کە زیـادەڕۆیی ڕۆڵی گەورەی لەم زەمینەیەدا گێڕاوە. مرۆڤ هەر بە سـروشـت حەزی لە زیادەڕۆییە. هەرگا شتێکیان لە کەسێک بە جۆرێک بینی، بێ شک لە ڕاگوێزانەکەیدا دەبێت زیادە و سـەر و کلکی بۆ بکەن. مرۆڤ ناتوانێت شـتێک ڕێک وەک ئەوە بگێڕێتەوە کە بینیویەتی و بیسـتوویەتی، ئیللان و بیللان دەبێت یان بەمسـەر یان بەوسـەردا کەم و زیادی بکات بەو هەست و سـۆز و لایەنگیرییە ئەرێنی و نەرێنییـانەی هەیەتی. هەروەهـا زیـادەڕۆییەکە لەگەڵ زیـاتر بڵاوبوونەوەی هەواڵەکەدا زیـاتر دەبێت. ئەمە بۆ هەواڵی شـێخ سـەلیم و جنۆکە و هەر هەواڵێکی بڵاو بەنا خەڵکیدا ڕاست و دروستە!

**من لە بۆچوونی سەلامە موسا دەرهەق بە یوسف وەهبی، شتێک لە ڕاستی دەبینم. ئەوەی یوسف وەهبی لەبارەی شێخ سەلیمەوە دەیڵێت، دەبێتە ڕەواجدان بە بابەتی جنۆکە و گشتاندنی خورافە**

**لەبارەی جنۆکەوە لەناو دەنگی گشـــتیدا. نابێت بیریشـــمان بچێت کە ولاتانی نوســـتوو پڕن لە دەججال‌ســـیفەت کە بانگەشـــەی پەیوەندی لەگەڵ جنۆکەدا دەکەن و یەک چرکەش لە فریودانی خەڵکی پشـــوو نـادەم. بۆیە وای دەبینم لە گێرانەوەی چیرۆکی شـــێخ ســـەلیم و هاوشێوەکانیدا یارمەتییەک پێشکەشی ئەو دەججالانە دەکرێت تا برەو بە پیشە چەپەڵەکەیان بدەن. تۆ چ دەڵێی؟**

دوکتۆر: ئەم رایەی تۆ لە هەنـدێـک ڕووەوە لە ڕای بیرمەنـدە مارکســـییەکانی یەکێتیی ســـۆڤیەت دەچێت ئەو کاتەی ئەم بابەتە لە ڕۆژئـاوا دەرکەوت دەیـانگوت ئەمە یـارمەتیـدەری بیرە غەیبی و ڕۆحییەکان دەکات. کەچی لە کۆتاییشـدا ناچار بوون دانی پێدا بنێن و توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی لەبـارەوە بکەن. هەرچەنـد هێشـــتـاش هەندێکیان لەســـەر بیرۆکە کۆنەکەی خۆیان ماونەتەوە و دژایەتی دەکەن.

ڕاستییەکەی ئەوەیە، ئێمەش جاری وایە ڕووبەڕووی ڕاستیگەلێکی زانسـتی دەبینەوە کە بێبەش نییە لە گرێ گوێرە و تەنگەبەری، ئەوەی لە زمانی ئینگلزیدا پێی دەڵێن (Dilemma). بڵاوکردنەوەی هەندێک لە ڕاســـتییە نوێیەکان دەبێتە مایەی زیانی کۆمەڵایەتی، کەچی لە هەمان کـاتیشـــدا پێویســـتە بڵاو بکرێنەوە چونکە ئەو زیانەی لە ڕێگریی بـڵاوکـردنەوەیـدا دەکەوێتەوە، ڕەنـگە گەورەتـر بێـت لە خـودی بڵاوبونەوەکەی لە درێژخایەندا.

ئەو بڕوا خورافییانەی لەناو ڕەشـــەخەڵکدا بڵاو دەبنەوە، هێدی هێدی بەهۆی کاریگەریی شـارسـتانییەتی هاوچەرخەوە چرایان بەرەو خامۆشـــی دەچێت. لە ســـەرەتای ئەم چاخە هاوچەرخەوە لە ولاتە پێشـــکەوتووەکاندا داویە لە کزی و پووکانەوە. ئێســـتاش نۆرەی پووکانەوەیەتی لە کۆمەڵگە نوسـتوو و دواکەوتووەکاندا. ئەم شـەپۆلە هێندە بەتین و تاوە، هەرچی بێتە ڕێی، لەگەڵ خۆی ڕای دەماڵێ.

بۆ نموونە تەماشـــی بیروبڕوای جنۆکە بکە بەر لە پەنجا ســاڵ. وەبیرم دێ ئەوســا خەڵکی لە هەموو شــوێن و کاتێکدا جنۆکەیان دەبینی و بەتایبەتیش لە تەنگەی شەودا. ئەگەر پەڵە سێبەرێکت دیتبا، خێرا دەتگوت جنۆکەم بینیوە. ئەگەر بەچکەی یەکێک نەخۆش کەوتبا، دەیانبردە لای فاڵچی نوشــتەی بۆ بنوســێت تا لە جنۆکە و چاوی حەسوود بەدوور بێت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە، تا نووری کارەبا زیاتر بێت و بە زۆرترین نـاوچە و ئـاواییـدا بڵاو بکرێتەوە، بیرۆکەی جن و پەریش کەمتر دەبێتەوە. ئەو فانۆســە بچکۆلانانەی ئەوســا خەڵکی ســوودیان لێ دەبینین، یەکێک بوون لە گەورەترین هۆکاری بڵاوبوونەوەی عەقیدەی جن لە شار و وڵاتدا. ئەو نوورە لاوازە پرتەپرتکەرەی لە گشت شەقام و ماڵێکەوە دەهاتە دەرێ، وای لە خەڵکی دەکرد شــێوەی جن بکەن و تێبینیی جووڵە و هەڵەبز و دابەزەکـانیـان بکەن. هێشــتـاش ئەو ڕۆژگارانەی منداڵییم بیر دێتەوە کە فانۆسمان بە چڵاکەوە هەڵدەواسی و بۆ هەرکوێ دەچوین، جنۆکەکان دوامـان دەکەوتن. بەڵام ئێســتـا نەوەکانم لە هیچ شــوێنێکەوە جنۆکە نابینن و، هیچ هۆکارێکیش نییە پاڵیان بۆ ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە پێوە بنێت.

**پوختەی قســان:** ئێمەومانان نابێت لە بڵاوبوونەوەی هەواڵی نوێی زانســتی بســڵەمێینەوە، ئەگەرچی بە شــێوەیەکی کاتییش بێتە هۆی بڵاوبوونەوەی خورافە. بێگومـان شــەپۆلی شــارســتـانییەتی نوێ دەستەبەری لەناوبردنی ئەو خورافانەی دووروبەرمان دەکات.

## هەندێکیان تاکێک دەخەوێنن و هەندێکیش گەلێک

(التضامن ١٤/٢/ ١٩٨٧ ژمارە ٢٠١)

لە زنجیرەی "گفتوگۆکان لەگەڵ دوکتۆر وەردی" لەمەڕ زانستی دەرئاساناسی (پاراسایکولۆجی)، ماجید سامەڕایی بابەتی خەواندنی موگناتیسی دەوروژێنێت؛ ئەو بابەتەی بەلای دوکتۆر وەردییەوە گرنگییەکی زانستیی گەورەی لە بازنەی زانستی دەرئاساناسیی نوێدا هەیە. دەقی گفتوگۆکەش بەم شێوەیە بوو:

**دەشێ کورتیلە مێژوویەکی خەواندنی موگناتیسیمان پێ بڵێن؟ ئەی لە کەیەوە لە مێژووی مرۆڤدا بەکار دێت و لە کەییشەوە زانست دانی پێدا ناوە؟**

دوکتۆر: خەواندنی موگناتیسی هونەرێکی کۆنە و خەڵکی لە دێر زەمانەوە بەبێ ئەوەی لە گرنگییەکەی بزانن بەکاریان هێناوە. لەگەڵ جادوو و فاڵ و ئەو جۆرە بابەتانەدا تێکەڵ بووە و تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمیش هەروا مایەوە تا دەرکەوتنی دوکتۆر (ئەنتۆنی مسمر)، کە هەوڵی دا بەبێ تێکەڵاوکردنی جادوو و فاڵ بەکاری بهێنێت و ناویشی لێنا (موگناتیسی زیندەیی) و، لە ڕێگەیەوە چەند نەخۆشییەکی جەستەیی و دەروونی چارەسەر دەکرد. ڕەنگە گونجاو بێت کەمێک باسی ئەم کەسایەتییە -و ئەو ماندوویەتییەی لە ڕێگەی ئەم بانگەوازە نوێیەدا توشی بووە- بکەین.

(مسمر) لە ١٧٣٤ لەدایک بووە و لە ڤییەننا پزیشکیی خوێندووە. سەری لە ئەڵمانیا و سویسرا و فەڕەنسا داوە. ئەو شتەی خۆی

نماییش کردووه که ناوی نابوو موگناتیسـی زیندەیی. بەو بۆنەیەوە ناوبانگی پەیدا کرد و لەلایەکەوە پشتیوان و لە لاکەی دیکەشەوە نەیار و دژی بۆ خۆی کۆکردەوە. لە سـالّی ١٧٨٤ لیژنەیەکی زانسـتی بۆ تـاقیکردنەوەی مسـمر کۆ بوویەوە. ئەنجـامی لێکۆلّینەوەکە: گوایە جادووگەر و فالّچییە –زۆر بەداخەوە!

ناوبراو لە سـالّی ١٨١٥دا وەفاتی کرد کە هێشـتاش بانگەوازەکەی لەنێوان وەرگرتن و ڕەتکردنەوەدا بوو. پـاش ئەمیش لە بەریتـانیـا کـابرایەک دەرکەوت کە توانی لەبـارەی خەوانـدنی موگنـاتیسـییەوە بابەتێکی زانسـتیی جێگەی ڕێز پێشـکەش بکات، ئەویش دوکتور (جەیمس برێد) بوو، لەدایکبووی ١٧٩٥. ئەم مێرخاسـە ئەو خەواندنەی دۆزییەوە کە ئەمڕۆ هەیە و لە هەنـدێـک وەهم و لێلّییش خـاوێنی کردەوە. هەر ئەو ناوی خەواندن (Hyfnotism)ـشی لێنا و وشەکەی لە زمانی یۆنانی کۆنەوە وەرگرتبوو.

ئەمیش چەنی مسمر بەشـی خۆی نەیاری لێ پەیدا بوو کە شتێکی نامۆ نییە چونکە ئەوە ناموسـێکی مرۆییە و شـوێنەواری لە گشـت شـوێنکاتێکدا هەیە. بە حاسـتەم مرۆڤێک دەتوانێت داهێنانێک نمایش بکات بەبێ پەیدابوون و زیتبوونەوەی چەند نەیار و ڕێگرێک –بە هەر شێوەیەک لە شێوەکان بێت.

تـاوەکو ئەمڕۆش، خەواندن بەشـی خۆی هەر نەیـار و دوژمنی هەیە. بەلام –بە خۆشـحـالّییەوە- ژمـایەیـان ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر دەبێتەوە. لە سـالّی ١٩٦١، ئەو کاتەی دەولّەتی سـۆڤییەت ڕێگەی دا بە مامۆسـتا فاسـیلیف تا توێژینەوە دەرئاسـاناسـییەکانی دەسـت پێ بکات – کە پێشـتر لەسـەری حەرام کرابوو-؛ ناوبراو هەسـتا بە سـازکردنی کۆڕبەندێک بە ئامادەیی هەندێک مامۆسـتـای زانکۆی لینینگراد کە خۆشـی سەرۆکبەش بوو لەوێ. لە باسی دانیشتنەکەدا دەزگای (تاس) بـاسـی ئەوەی کردبوو کە یەکێک لە ڕۆژنـامەوانەکـانی ئـامـادەی

کۆڕبەندەکە هەستاوەتەوە بە ستایشەوە باسی هەندێک لە دەرئاساکان دەکات کە دوکتۆر فاسـیلیف لێکۆڵینەوەیان لەسـەر دەکات و دەڵێت: (سـەردەمی ئەوە گوزەرا خەڵکی خەواندنی موگناتیسـییان بە جۆرێک لە فرت و فێڵ دەزانی؛ وا ئێسـتەکانێ بۆ چارەسـەری نەخۆش بەکار دەهێنرێت).

**دەکرێ شتێکمان لەبارەی سروشتی خەواندنی موگناتیسییەوە پێ بڵێیت؟ ئایا چ جیاوازییەکی لەگەڵ خەوتنی ئاساییدا هەیە؟**

دوکتۆر: خەواندن هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ خەوی ئاسـاییدا نییە، مەگەر تەنها یەک شت، ئەویش خەوێکی دەستکردە لە ڕێگەی پێوتنەوە دەخرێ لە مرۆڤ؛ ئەو پێوتنەش لەلایەن (خەوێنەر)ـەوەیە کە خەوتووەکە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی خەوێنەرەکەوە بە شـێوەیەک ئەوەی پێی دەڵێـت بەبێ دوودڵی و پەژارە لە زۆرینەی کـاتەکـانـدا دەیکات.

ڕاسـتە ئەگەر بڵێین ئەو کەسـەی دەخەوێنرێت هەم خەوتووە و هەمیش بێدار. خەوتووە لەبەر ئەوەی هیچی چواردەوری هەسـت پێ ناکات و نابینێت؛ بێداریشە لەبەر ئەو پەیوەندییەی بە خەوێنەرەکەیەوە هەیە و بینینی ئەو شـتانەی خەوێنەرەکەی دەیهەوێت بە هەق یان بەتاڵ پێی ببینێت. ڕەشی لێ دەکات بە سپی؛ بۆگەنی لێ دەکاتە گوڵاو، هەبوو دەکاتە نەبوو، یان نەبووی لێ دەکاتە هەبوو.

لە هەردوو خەوەکەدا – ئاسـایی و موگناتیسـی- عەقڵی ئاگا دادەپۆشـرێت و عەقڵی ناخودئاگا (نەسـت) دەکەوێتە کار. بەڵام کەوتنەکاری نەست لە خەوی ئاساییدا بێسنور و ڕەهایە و هیچ کۆت و بەنـدێـک نـاییەسـتێتەوە و ئـالوودەی هەوەس و ئـارەزووی سەرکوتکراو و ئیلهام و شتانی تێکەڵ نییە کە وا دەکات ڕاڤەکردنەکەی

زۆر دژوار بێت. بەڵام لە خەواندندا نەســـت ملکەچی ئامـاژەکانی خەوێنەرە و لە هەندێک کاتیشدا زیانبەخشە.

**لە توێژەری رووسی (ڤاسیلیف)ـــەوە رات گواست کە وتوویەتی: خەواندن بۆ چارەســـەری پزیشـــکی بەکار دێت! بەلامانەوە گرنگە ئەوەمان بۆ روون بکەیتەوە؟**

گرنگترین بەکـارهێنـانەکـانی خەوانـدن بۆ چـارەســـەری ئەو بیمارییانەیە کە لەســـەر شـتی دەروونی دروســت بوون... ئەوەشـی لەلایەن خەوێنەرەوە پێی دەگوترێت، کەم تا زۆر یـارمەتی دەدات لە چاکبوونەی نەخۆشـییەکەی. ئەو گەنجەی توشـی لاوازیی سـێکسـی بووەتەوە، خەوێنەر لە رێگەی خەواندنەوە ســـودی پێ دەگەیەنێت و نیگا دەنێرێتە مێشـــکییەوە کە ئەم لە روی ســـێکســـییەوە بەهێزە. هەروەهـا ئەو ژنەی لە ئەنجامی غیرەی زۆر لە پیاوەکەی توشـــی شەلەلی هیستری بووە، خەوێنەر دەتوانێت یارمەتی بدات و دەردەکەی بپەڕێنێـت. راســـتییەکەی ئەوەیە: لایەنی دەروونـی لە زۆربەی نەخۆشـــیەکـانـدا رۆڵی گەورە دەگێرێـت. هەر بۆیەش خەوانـدن بە شێوەیەک لە شێوەکان رۆڵ لە شیفاگرتنیدا دەگێرێت.

هەمـدیس خەوانـدن بۆ تەرککردنی ئـالوودەیی بەکـار دێـت. لە دوکتۆرێکەوە بەناوی (بێرنارد جیندس)ـەوە دەگێڕنەوە کە چارەسەری پێشـــکەش بە زیاتر لە هەزار ئالوودە کردووە و لە زۆربەشـــیاندا ســـەرکەوتوو بووە. شـــێوەکەشـــی: ئالوودەبووەکەی خەواندووە و قومێک شـەرابی داوەتی و نیگای بۆ کردووە کە ئەمە ماددەیەکی پیس و پۆخڵە و پێی وتووە بڕشـێتەوە. ئیدی لەوسـاوە شـەرابی لەبەرچاو کەوتووە.

پزیشـــکێکی دیکە لە چارەســـەری قەڵەویی ڕاددەبەدەری ژناندا ســـەرکەوتن بەدەســـت دەهێنێت بە شـــێوەیەک نیگای بۆ دەکردن کە ئەگەر یەک پارووی زیاتر بخۆیت لەوەی دیاری کراوە، هەسـت بە دڵ تێکەڵهاتن دەکەیت و حەزت لێیە بڕشێیتەوە. بەم شێوەیەش دەیتوانی لە هەر هەفتەیەکدا یەک کیلۆ لە کێشیان داگرێت.

لە نەخۆشـخانەیەکی لەندەن خاتوونێکیان هێنا گرێی شـێرپەنجەیی لە مەمکیدا دروست ببوو. دەمێ ویستیان بەنجی بکەن و نەشتەرگەریی بکەن، دیتیـان گەر بەنجی بکەن، دڵی ڕادەوەســـتێـت. بـانگی دەروونپزیشـکێکیان کرد و نیگای بۆ کرد وا لە کەناراوەکانی ڕیڤێرای فەڕەنســا و هەســت بە نەرمە ســـەرمایەک دەکات بەڵام بەبێ ئازار. خاتوونەکە بەردەوام بوو لە خەونە موگناتیسـییەکەی بەو شـێوەیەی خەوێنەرەکە پێی دەگوت لە کاتێکدا پزیشک خەریکی نەشتەرگەرییەکەی بوو. پاش تەواوبوونی نەشـتەرگەرییەکە، خاتوونەکە هەسـتا لە خەوی موگناتیسی و وتی: (هەر بەڕاستی خەونێکی خۆش بوو! خەریک بووم لە شـارێکی سـپی لە باشـووری فەڕەنسـا لە کەنراوەکانیدا پیاســەم دەکرد و دار و درەختی خورمام دەبینی داچەمیبونەوە ســـەر دەریا شینەکە).

**دەرئاسای زۆرمان لەلایەن خەوێنەرە موگناتیسییەکانەوە بینیوە و بیســـتووە؛ پەیوەندیی نێوان خەواندن و دەرئاســـا چییە، ئەوەی کە زانستی دەرئاساناسیی نوێ لێی دەکۆڵێتەوە؟**

دوکتۆر: پەیوەندیی دەرئاســـا باوەکانی نێو کۆمەڵگە و خەواندن هەرس ناکرێت. هێندە بەسە لێرەدا باسی پەیوەندیی نێوان خەواندن و ســـووســـەکردن و خســـتنەدڵ بکەین؛ ئەوەی بیرۆکەیەک دەهاوێتە مێشکی کەسێکی دیکە.

لە بەشی پێشوودا باسی ئەوەم کرد هێزی سووسە و خستنەدڵ کەم تا زۆر لە گشـــت بنیادەمێکدا هەیە. هەیانە هێزەکە تێیدا بەتین و هەشـــە بێتینە. دەشـــبێ ئەوە بڵێین: ئەم هێزە نەســـتییە و لەکاتی خۆ خەریککردن بە بیرکردنەوەی ئاگایانە و کاروباری دنیاوە لاواز دەبێت. هەرچی لەکاتی خەواندنی موگناتیســـیشـــدا، بیرکردنەوەی ئاگایانەی لۆژیکی لە زیهنی مرۆڤدا لاواز دەبێت یان هەر دیار نامێنێت و نەســت خۆی بەتەنها دەمێنێتەوە و خۆشی ڕادەستی خەوێنەر دەکات. ئا لەم کاتەدا هێزی خستنەدڵ لەوپەڕی خۆیدا جیلوە دەکات.

خۆم لە ساڵی ١٩٣٨دا یەکەم ئەزموونی خەواندنی موگناتیسیم کرد و دواتـر ئەزمـوونەکـان زۆرتـر بـوون. پـوختەی هەوەڵ ئەزمـوون ئەوەبوو یەکێک لە خەوێنەرە بەناوبانگەکانی نیشـــتمانی عەرەب هاتە عێراق کە یاریدەرێکیشـــی لەگەڵ بوو وا بڵاوی کردبوویەوە کە کوڕی خۆیەتی. ئەدی ئەوان لە ســـەکۆکـانی بەغـدادا چەنـدین چـالاکییـان ئەنجـامـدا کە کوڕەکەی دەخەوانـد و وای لێ دەکرد لە ڕێگەی دڵخوێندنەوەوە بیرۆکەکانی بخوێنێتەوە. خوا کردی هەلم بۆ ڕەخســـا لە دانیشتنێکی تایبەتدا –پاش پێدانی کرێکەی- لەگەڵی دانیشم. ئەوسا هەســـتا بە خەواندنی یاریدەدەرەکەی و داوای لە منیش کرد لە پارچە کاغەزێکدا ناوی خۆم و باوک و باپیر و پیشــە و نازناو بنوســم. پاش ئەوەی خۆی خوێندییەوە، پرســـیاری لە یاریدەدەرەکەی کرد، ئەویش بەتەواوی ئەوەی نوســـــرابوو وتـی. بە ئەزمـوون بـۆم دەرکەوت یاریدەرەکە لە زیهنی مامۆســـتاکەیەوە ئەو شـــتانەی وەرگرتووە، نەک لە زیهنی منەوە. بۆ ئەوەشـــی لەوە دڵنیا بمەوە، هەندێک پرســـیارم لە یاریدەدەرەکە کرد کە خەوێنەرەکە نەیدەزانی، کەچی وەڵامەکەی یان ناڕوون بوو، یان ناڕاست.

دواتر لێم ڕوون بوویەوە ئەو یـاریـدەدەرە لە ئـاســـتێکی بەرزی دڵخوێـنـدنەوەدا نەبووە چونکە لە گەشـــتەکـانم بۆ دەرەوەی عێراق

یاریدەدەرگەلێکم بینی دەیانتوانی بیری دیگەران ڕاستەوخۆ بخوێننەوە بەبێ یارمەتی خەوێنەر؛ هەروەک یاریدەدەرانێکی دیکەشم بینی، وێڕای هێزی دڵخوێندەوە، شتیشیان دەبینی. ئەمە هێزی بینینی شتانە لەدوور یان لەپشت پەردەوە پێی دەگوترێ چاوتیژی.

## پەیوەندیی خەواندن بە جادووەوە چییە؟

دوکتۆر: مەبەستت لە جادوو چییە؟ دیارە جادوو دوو مانای جیاوازی هەیە و ماناکەی لای گەلانی سەرەتایی جیاوازە لە هاوچەرخەکان. ڕەنگە ئەتۆ مەبەستت لە جادووی چاو بێت، ئەو هێزەی کە دەتوانێت جەماوەر بخەوێنێت و شتانێکیان لە بێجگە شێوەی خۆیاندا نیشان بدات یان شتانی ئامادە نەبوویان نیشان دەدات.

نابێت ئەوەمان بیر بچێت کە خەوێنەر دەتوانێت هەر بیچمێکی دەیهەوێ لە زیهنی خەوێنراودا دروستی بکات. دەیەوێت نیشانی بدات وا شێرێ بەرەوڕووی دێ، یان ئەوەتا لە باخاتێکی بەسیبەری پڕ جۆباردا؛ یاخوود لە دەشتێکی کاکی بەکاکی، یان هەر هێنانە پێشچاوێکی دیکەی خەوێنەیی کە خەوتووەکە بەڕاستی بزانێت و وا بزانێت ڕاستییەکی.

هەمدیس نابێت ئەوەشمان بیرچێت کە خەوێنەرەکانیش ئاستیان جیاوازە. هەیانە تواناکەی فراوانترە و دەتوانێت زیاتر لە یەک و دووانێک -کۆمەڵێک- بخەوێنێت و ئەوەش بخاتە دڵیانەوە کە خۆی دەیەوێت. ئەمە ئەوەبوو کە جادووبازەکانی سەردەمی پێغەمبەر مووسا کردیان بەو شێوەیەی -لەپێشتردا- تەورات و -دواتر- قورئان باسیان کردووە. قورئان وا باسی دەکات کە (جادوویان لە چاوی خەڵکی کردووە: سحروا أعین الناس)؛ ئەوەش واتە: جادووگەرەکان

جەماوەرەکەیان خەواندووە و وایان لێ کردوون ئەو دار و گوریس و تێلایانەیان لێ ببێتە مار.

کە منداڵ بووم گوێم لە بەتەمەنەکانی خۆمان بوو باسی جادووبازێکیان دەکرد لە شەستەکاندا سەدەی ڕابردوو (١٨٦٠ـەکان) هاتبوویە عێراق بە ناوی (مەڵکەم خان). هەواڵی سەیری زۆریان لەبارەوە دەگێڕایەوە. بەندەش لە سەرەتاوە لەبەر نامۆیی بابەتەکان بڕوام پێ نەکرد تا دەستم گیر بوو لە کتێبی نوسەری بەریتانی (برسی سایکس) کە لە ئێران ماوەیەک ژیابوو و دەنگوباسی دەرئاساکانی مەڵکەم خانی لە کەسێکی جێ متمانەوە بیستبوو کە خۆی بە چاوی خۆی بینیبووی.

بەتەمەنەکان دەیانگێڕایەوە کە ئەو جادوبازە کە نزیکی هەڵواسراوەکانی دووکانەکانی بازاڕ دەبوویەوە، شتەکان بەرەولای کێش دەبوون وەک ئەوەی موگناتیسی پێ بێت. جارێکیان میوانداری کرابوویە سەر خوانچەیەک کە مریشکی سوورەوکراوی تێدا بوو؛ ویستبووی مەسخەرە بە ئامادەبوویەک بکات، مریشکەکەی دەستی بە پێشچاوی ئامادەبووانەوە فڕاندبوو. والیی بەغداش دوای بیستنی دەنگوباسەکانی، بانگێشتنی لێ کردبوو و لە کۆڕەکەشیدا زانا و ماقووڵانی بانگ کردبوو. مەڵکەم خان ڕیشی خۆیانی بەو مقەسانە پێ بڕین کە بۆ بڕینی بۆڵە ترێکان دابوونێ. ئەو کاتەشی سەردانی لەندەنی کردووە، شتانێکی سەیر و سەمەرەی کردووە کە خەڵک ئەبڵەق بین و ببنە باسی ڕۆژنامەکان.

**له هەندێک کتێبدا باسی شتێکت کردووه بەناوی (خەواندنی جەماوەری)، ئەوه چییه؟ ج ڕوویەکی لێکچوو یان جیاوازی لەگەڵ خەواندنی موگناتیسییدا هەیه؟**

دوکتۆر: به بڕوای من خەواندنی جەماوەری جۆرێکی سادەی خەواندنی موگناتیسییه. مرۆڤ هەر له منداڵییەوه چەندین ئیلهامی بەردەوام لەبارەی بابەته عەقیدەیی و پێوەره ئەخلاقی و خوونەریتەکان له کۆمەڵگەکەیەوه وەردەگرێت. ئەمەش خۆی له شێوه خەواندنێکدا دەبینێتەوه که ناتوانێت جیهان له بێجگه ئێرەوه ببینێت. زۆرێک له بڕوا و پێوەرەکان که له گەلاندا تێبینییان دەکەین و بەلامانەوه زشت یان ناعاقڵانەن، کەچی له دیدگای دیگەرانەوه، ئەوانەی تێیدا گەوره بوون لەوپەری جوانی یان عەقڵدایه. ئەو له چوارچێوەی ئەو خەواندنانەوه تێی دەڕوانێت که لەگەڵیان گەوره بووه له کاتێکدا ئێمه له ڕووانگەی خەواندنێکی دیکەوه تەماشای دەکەین. خۆ ئەگەرەکینەی لەجێگەی ئەودابایەن، دەقاودەق وەک ئەو بیرمان دەکردەوه.

خەواندنی جەماوەری له کۆمەڵگه شپرزەکاندا دەگاته چڵەپۆپەی خۆی. له عێراقیش زۆرمان بینیوه. تاک کاتێک خۆی دەلکێنێت به کۆمەڵێکی شپرزەوه، خۆی بیر دەچێتەوه و لەناو ئەو خەواندنه شپرزەدا نغرۆ دەبێت؛ ئا لەو کاتەدا ڕەش به سپی و سپی به ڕەش بەپێی ئەو ئیلهامانەی بەسەریدا زاڵ دەبن دەبینێت. ئەو به هەموو نەترسییەکەوه خۆی دەخاته باوەشی مەرگەوه کاتێک دەبینێت دەورەیان لێ داوه. به زشترین و ناپەسەندترین کار و تاوانەوه دەگلێت و خۆشی وا دەزانێت ئەوه لەپێناو خودا یان نیشتمان یان بەرژەوەندیی گشتییدا دەکات. ئەو دەمەشی جادووی خەواندنەکەی بەسەرەوه نامێنێت، خۆی له خۆی سەری دەسوڕمێت و سەیری لێ دێت ئایا هەر بەڕاست ئەوه ئەو بووه ئەو کارانەی ئەنجام داوه؟ لەپای چی؟

**ئەم بابەتە کێشـمان دەکاتە ناو بابەتی پڕوپاگەندە؛ ئایا پڕوپاگەندە چۆنایی کاریگەری لەسـەر خەڵکی جێدەهێڵێ؟ واتە لەپێناو ئامانجێکی دیاریکراو کە بۆی دەکۆشن دەیانخەوێنێت؟**

لە توانای پڕوپاگەندەدایە خەڵکی بخەوێنێت و بەرەو ئەو مەبەست و ئامانجە بیانبات کە پڕوپاگەندەکەی (گۆبلز) لە ئەڵمانیا لە سەردەمی نازییەکاندا کردی. بەڵام مەرجێکی بنەڕەتی هەیە کە دەبێت لە پڕوپاگەندەدا هەبێت تا کاریگەریی هەبێت؛ ئەویش لەگەڵ مەیلی خەڵک و ئاڕاستە نەستییەکانیاندا ڕێک بێتەوە. گەلی ئەڵمانیا لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی لەلایەن هاوپەیمانانەوە بۆژە کرابوو و هەستی دەکرد هەقی خوراوە؛ گۆبلزیش دای لەم وەتەرەوە، بۆیە زۆرترین خەڵک بەدەنگییەوە هاتن.

لە گۆبلز دەگێڕنەوە وتوویەتی: (درۆ بکە و بیکە، هەمدیس بیکە تا خەڵکی باوەڕت پێ دەکەن). ئەمە ڕاست نییە مەگەر ئەو کاتەی لەگەڵ مەیل و ئاڕاستە نەستییەکانی خەڵکیدا تەبا بێتەوە. هەر بە سروشت بنیادەم حەزی لە وەڕاست زانینی ئەو شتانەیە کە لەگەڵ پاڵنەرە نەستییەکانیدا دێنەوە، با درۆش بن و، حەزیشی لە بەدرۆزانینی پێچەوانەی نەستەکانیشییەتی با ڕاستیش بن.

ئەو پڕوپاگەندەیەی پێچەوانەی پاڵنەرە نەستییەکانە و دەیەوێت لە ڕێگەی ئیلهامی دووبارەکردنەوەوە کاریگەری لەسەر مەردوم جێ بهێڵێت، کاریگەرییەکەی تەواو بەراوەژوو دەبێتەوە.

**لە ناوەندە یاساییەکاندا بابەتی خەواندن بە تاوان لەقەڵەم دراوە؛ ئەگەر خەوێنەر بتوانێت کۆنترۆڵی خەوێنراوەکە بکات، ڕەنگە توشی تاوان و جەریمە بێتەوە، ڕات چییە؟**

ئەوە ڕاســـتە. لەژێر کاریگەریی خەواندندا چەندین تاوان ئەنجام دراوە و گەورەترینیشیان ئەوەی ساڵی ١٩٥١ــی دانیمارک بوو کە لە کاتی خۆیدا ڕۆژنامەکانیش باســـیان کرد. پوختەکەشـــی ئەوەبوو خەوێنەرێک توانیبووی خەوێنراوەکەی بنێرێتە دزی و کوشـــتار. لەو ڕێگەیەشـــەوە ســـەرمایەیەکی باشـــی جەم کردبوویەوە. خەوێنراوەکە گەنجێکی ســـادەلەوحی ئیمان قاییم بووە. کابراش هەر لەم ڕێگەیەوە چووبوویە بنکڵێشـــەی و پێی وتبوو دەرگاکانی بەهەشـــتی بەدەســـتی خۆی بۆ دەکاتەوە و دەبێت دزی لە بانکەکانی دەوڵەت بکات لەپێناو نیشـــتمانەکەیدا و خەمیشـــی نەبێت فریشـــتەکان لە کاتی دزییەکەدا پارێزگاری لێ دەکەن، لەو بارەیەوە ئەرخەیان بێت.

ئیدی جارێکیان خەوێنراوەکە چوویە بانکێکەوە و دەمانچەکەی خستبووە سەر سەری خەزنەدار و وتی هەرچی پارەی تێدایە بیداتێ. کاتێک خەزنەدار ڕەتی کردبوویەوە، فیشەکێکی پێوەنابوو بەمەبەستی کوشـــتن، ئەوســـا وەک ئەوەی هەر هیچ ڕووی نەدابێت لە بانکەکە چووبوویە دەرێ، چونکە دڵنیا بوو فریشـــتەکان پارێزگاری لێ دەکەن و ئەوەشی کردوویەتی ئەرکی سەرشانی بووە لەپێناو نیشتماندا.

کاتێک دەســـتگیریان کرد، بۆیان دەرکەوت بێتاوانە و تاوانباری ڕاســـتەقینە خەوێنەرەکەیەتی. لە دادگای کۆپنهاگنیشـــدا قازی ئەم پرســـیارەی لە خەوێنراوەکە کرد: (تۆ چۆن بەگوێی فریشـــتە پارێزەرەکانت دەکەیت پێت بڵێن بانک ببڕە؟) وەڵامی دایەوە: (فریشـــتەکان دەیانگوت گوێ بە شـــتەکە مەدە، هەموو پاڵەوانانی نیشـــتمان هەمان شـــت لەپێناو وڵاتەکەیاندا دەکەن). لە وەڵامی پرســـیارێکی دیکەدا خەوێنراوەکە دانی بەوەشـــدا نا: (ئەو کاتانەی لەبەردەم نیلســـندایە، هەســـت دەکات لەبەردەم دەرگای بەهەشـــتدا ڕاوەستاوە).

**پرســـیاریکمان ڕووبەڕوو دەبێتەوە: تا چ رادەیەک خەوێنراو بە داخوازییەکانی خەوێنەر هەڵدەستێت؟ ئایا سنوورێک هەیە خەوێنراو تێیدا ڕاوەستێت، یان ئەوەتا بێسنوورە و ڕەها؟**

هەندێک لە توێژەران دەڵێن: خەوێنراو تەنها بەو کارانە هەڵدەستێت کە لەگەڵ مەیلە نەستییەکانیدا ڕێک و تەبایە. دانیمارکییەکەی باسمان کرد، ئەو کارانەی لە هیچ سۆنگەیەکەوە جگە لە سۆنگەی ئیمانداری و نیشـــتمانپەروەری نەکردبوو. خۆ ئەگەر خەوێنەر داوای شـــتێکی پێچەوانەی لێ بکردایە، بێگومـــان نەیدەکرد[١٢]. ئەمە بەســـەر پڕوپاگەندەشـــدا جێبەجێ دەبێت کە پێشـــتر باسـمان کرد. پڕوپاگەندە خەواندنێکی ســـادەترە و تەنها لەو کاتانەدا کاریگەر دەبێت کە لەگەڵ هەوەس و ئاڕاســتە نەستییەکاندا بێتەوە. خۆ ئەگەر پێچەوانەیان بێت، ئەوە بەراوەژوو کارەکە ئەنجام دەدات.

ڕۆژنامە میســـرییەکانی لە چلەکاندا باســـی پزیشـــکێکیان کرد کە کچەخزمەتکارەکەی خۆی هین کردووە. ئەوەشـــی دوای ئەوە کردووە کە خەواندوویەتی. وا دیارە لەکاتی خەواندنەکەدا خســـتوویەتییە دڵی کچەکەوە کە لەســـەر فەرمانی خودا و ســـوونەتەتی پێغەمبەر مارەی کردووە و ئەویش بڕوای پێ کردووە و خۆی بۆ شل کردووە!

---

[١٢] - دەبێت ئەوەش بڵێین کە پێش خەواندنی تەواوەتی، خەوێنەر چەندینجار گفتوگۆ لەگەڵ خەوێنراوەکەدا دەکات و ئەو شـــتانەی دەیەوێت لە مێشـــکیدا دەیچێنێت بۆ ئەوەی لە کاتی خەواندنەکەدا بگەنە مەبەســـت و مەرام. پاشـــان دەبێت بزانین ئەم کارە زیاتر لە بەرژەوەندی خەوێنەردایە و بۆ تێرکردنی ویســـت و ئارەزووەکانی ئەوە. ئەو نەیهەوێ، کەس ناخەوێنێ. کەواتە دەبێت زۆرترینی سوود بۆ ئەم بێتەوە. وەرگێڕ

**پرسیاری کۆتاییم پەیوەندیی خەواندن بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە چییە؟ ئایا هێزی خەواندن کاریگەری لەسەر سەرکەوتن یان سەرنەکەوتن لە ژیاندا هەیە؟**

دوکتۆر: چەندینجار گوتوومە و لێرەشدا دەیڵێمەوە: مەردووم لە رادەی تواناکانیاندا جیاوازن و لە سیفەتەکانیشیاندا پلە پلەن. هەیە بەهێز و هەشە لاواز. ئەمە بەسەر هێزی خەواندنیشدا جێبەجێ دەبێت وەک چۆن بەسەر ئەوانی دیکەشدا چ دەرئاسا و چ ئاسایی جێبەجێ دەبێت.

کەسانێک هەن توانایەکی زۆریان لە خەواندنی دیگەراندا هەیە. هەیانە خۆشی نازانێت کە بەهۆی چاوەکانییەوە خەریکە یەکێک لە ژیانی ئاسایی و ڕۆژانەدا دەخەوێنێت. جاری وا هەیە ئەم هێزە دەورێکی کەمیشی لە سەرکەوتن لە ژیاندا نییە چونکە بە چاوەکانی دەتوانێت بڕوا بە بەرانبەر بهێنێت.

لە گفتوگۆی پێشوودا باسی هێزی دڵخوێندنەوەمان کرد و وتمان ڕەنگە بەشێک بێت لە هۆکاری ئەوەی خەڵک ناوی لێ ناوە "بەخت". لێرەدا دەتوانین بڵێین هێزی خەواندنیش ڕەنگە هۆکارێکی دیکە بێت. دەشێ کەسێک لە هەردووکی پێ بەخشرابێت. ئیدی هەوساری بەختی خۆی بەدەستەوە دەگرێت و، ئەگەرەکینەی بتوانێت لەگەڵ داناییدا لەکاتی بەکارهێناندا تێکەڵیان بکات و دۆخ و ڕێکەوتەکانیش یارمەتیدەری بن، ئەوا لە سەرکەوتندا دەگاتە سنورێکی زۆر دوور.

ئێمە کاتێک سەربوردەی ڕاسپۆتین دەخوێنینەوە، ئەو ڕاهیبە رووسییەی لە سەردەمی رووسیای قەیسەرییدا ناوبانگێکی فرەی کۆکردەوە، دەتوانین -لەم بارەیەوە- وانەی گرنگی لێوە دەربێنین.

ڕاسپۆتین لە ساڵی ١٨٦٨ لە یەکێک لە ئاواییەکانی هەڵکەوتوو لە ڕۆژهەڵاتی چیای ئۆراڵ لە دایک بووە. لە تافی لاوییدا عەرەبانەی

گێڕاوه. به تاوان و ئاژاوەگێڕی و ئاکاری خراپ ناوی دەرکردووه، بەڵام له هەندێک هێزی دەرئاسـاى وەک سـووسـەکردنی ئەرێنی و توانـای خەوانـدنـدا بەشـی درابوو. ئەو دوو بەهرەیه ببوونه هۆی چاککردنەوەی هەندێک نەخۆش. قەیسـەر دەنگوباسـی بیسـت و بانگێشـتنی کرد تا بێت و چارەی تاقه کوڕه -جێگرەوه-کەی بکات که نەخۆشـی خوێنبەروونی هەبوو. ڕاسـپۆتین له ڕێگەی خسـتنەدڵ و خەواندنەوه توانی چاکی بکاتەوه و بەم هۆیەشـەوه پێگەیەکی لای قەیسەر دەسکەوت کەس پێشتر دەستی نەکەوتبوو.

دەتوانین بڵێین لەپاش قەیسـەر، ڕاسـپۆتین بوویەوه گەورەترین کەسایەتیی ڕووسیا.

هەروەها دەیتوانی به ڕووسـیا بڵێیت بەشـداری جەنگی یەکەمی جیهانی مەکه لەبەر ئەو دەرەنجامه خراپانەی که دەیزانی تووشـی دەبێت، بەڵام تاوان و سـەرەرۆییەکانی نەیانهێشـت ئەو کاره بکات. ڕاسـپۆتین توانیبووی ئەو هێزەی بۆ بەزاندنی حەرەمی زۆرێک له ژنانی چینی باڵا بەکار بهێنێت. گوایه وتوویانه تەنانەت قەیسـەریش لێی ئەمان نەبووه – خوا پەنامان بەی!

ئەم کابرایه کەته و سـەرتاس و جل شـڕێکی قێزەون بووه، بەڵام خاوەنی دوو چاوی موگناتیسـیی بووه که به تەماشـا ژنانی ڕادەهێنا. یەکێک له زاناکانی دەرئاسـاناسـی ئاوەها وەسفی دەکات: (ژنانی چینی باڵا یەک خولەک له بەردەم ڕاسـپۆتیندا دەوەسـتان ئیدی دەچوونه جێخەوەکەی لەگەڵیدا).

له سـاڵی ١٩١٦ چینی باڵا ئارامیان له کار و بێئەخلاقییەکانی ڕاسپۆتین لێ بڕا، مەرجیان کرد بیکوژن، بەڵام نەیانتوانی مەگەر دوای هەوڵێکی زۆر زۆر ورد چونکه هێزه دەرئاسـاکانی تا دوا هەناسـەش یارمەتییان دەدا.

## بەخت وەهمە و بەهرە ڕێگەی سەرکەوتن

(گۆڤاری التضامن ١٨/ ٧/ ١٩٨٧، ژمارە ٢٢٣)

لە زنجیرەکانی پێشتری گفتوگۆ لەگەڵ وەردیدا کە گۆڤاری تەضامون بڵاوی کردبوویەوە، دوکتۆر باسی زانستی پاراسایکۆلۆجی کردووە کە خۆی ناوی ناوە (العلم الخارقیة) (دەرئاساناسی). ڕۆشنایی خستە سەر لایەنە نادیارەکانی زانستەکە کە دەیەوێت هێزە شاراوەکانی مرۆڤ نیشان بدات. لە وەڵامەکانی دکتۆر وەردیدا چەندین نوختەمان لەبارەی دەرئاساناسییەوە دەرهێنا کە بوونە هۆی مشتومڕی زۆرێک لای خوێنەرەکان و پرسیاری ئەوەی چەندە ئەم بابەتە بەلای زانست یان وەهمدا بای داوەتەوە. هەر لێرەشەوە (بەخت) و (ڕێکەوت) و گوتەزای ( من جد وجد: ئەوەی بکۆشێ دەنۆشێ) و شتانی دیکە کە خۆیان خزاندووەتە نێو بازنەی بڕواوە و خەڵکی کردوویانن بە پێوەر بۆ هەڵسەنگانی ئەم و ئەو و هۆی سەرکەوتن لێرە و سەرنەکەوتن لەوێ.

(تەضامون) ئەم پرسیارانەی ناوە بە تەنگەی دوکتۆر وەردییەوە و ئەویش ورد وردێ و نوختە بە نوختە شییان دەکاتەوە کە ئایا بەخت بنچینەیەکی زانستیی هەیە یان خەو و خەیاڵی ڕەشەخەڵکە؟ ئەمە بابەتی یەکەم هەڵقەی ئەم زنجیرەیەیە کە دواتر پەخشیان دەکەین.

دوکتۆر عەلی وەردی لە ژمارە ٢٠١ـی گۆڤاری تەضاموندا تەقەی لە دەرگای بابەتی بەخت داوە و باسی ئەوەی کردووە ئایا بەخت بنەمایەکی زانستیی هەیە یان هەر وەهم و خەیاڵاتی خەڵکە؟

ئەنترۆپۆلۆجییەکان[14] گەیشـــتوونەتە ئەو ئەنجامەی مەســـەلەی بەخت لەناو گشـــت گەلاندا بڵاوە، چ بە گەلانی پێشـــین، چ بە گەلانی شـــارســـتانی. بەڵام هێنـدە هەیە لەگەڵ بەرەوپێشـــچوون و شارستانیبووندا بڕواکە کەمتر دەبێتەوە، بەڵام هەرگیز بەتەواوی کپ نابێتەوە.

ڕەنگە بوترێ: بڵاوبوونەوەی ئەم بڕوایە لەناو خەڵکیدا بە جیاوازیی ئاستە شـارسـتانییەکەیان، بگەڕێتەوە بۆ سـەرکەوتنی هەندێک کەس بەبێ هیچ هۆکارێکی ئاشـکرا. هەر لە دێر زەمانەوە خەڵکی ڕاهاتوون هەر دیاردەیەکی دەرئاسا بگەڕێننەوە بۆ هێزێکی نادیار لە پشـتییەوە. ئەوان هەرکات تاکێکی ناو خۆیـان ببینیبێت کە بەبێ هیچ هۆکارێکی ئاشـــکرا ســـەرکەوتوو بووە، گورج هۆکارەکەیان بەســـتووەتەوە بە شتێکی نادیارەوە و ئەو شتەشیان ناو لێناوە (بەخت).

ســـەرکەوتن لە ژیاندا – وەک ئەوەی ئێســـتا بە زانســـتی ڕوون بووەتەوە- چەندین هۆکاری هەیە، گرنگترینیان بوونی بەهرەیە؛ دوای ئەمانەش دۆخی گونجاو و ڕێکەوتی باش. خەڵکی پێشـــتر شـــتێکی ئەوتۆیان لە بەهرە نەدەزانی. تاکێک لەڕێی بەهرەکانییەوە سەرکەوتنی بەدەســـت دەهێنا کە خۆشـــی بە بەهرەکەی نەدەزانی و دیگەرانیش نەیاندەزانی. ئەوان دەبوو ســـەریان لە هۆی ســـەرکەوتنەکەی ســـووڕ بمێنێت؛ دەشـبوو لێکدانەوە و شیکارییەکی گونجاوی لەگەڵ زانیاری و چەمکە سنووردارەکانی خۆیاندا بۆ بکەن.

بڕوا بە بەخـت لە هەنـدێـک ڕووەوە لە بڕوا بە جنۆکە دەچێت. مەردووم کاتێک هەندێک کاری دەرئاســـایان لە کەســـە بلیمەتەکان بینیوە، هـاتوون و داویـانەتە لای جنـدۆکە. بەڵام لەم دوادواییـانەدا

---

[14] – ئەنترۆ لە یۆنانیدا واتا مرۆڤ. ئەنترۆپۆلۆجی دەبێتە زانســـتی مرۆڤناســـی کە دەچێتە تان و پۆی مرۆڤی کۆن هەتا ئێســـتا و لە دیاردە و ســـروشـت و گشـت شتێکیان دەکۆڵێتەوە وبەراورد دەکات. وەرگێڕ

زانسـت هەندێک نهێنیی کارە دەرئاسـاکانی دەرخسـتووە، وەک چۆن دەسـتیشـی کردووە بە دەرخسـتنی هۆیەکانی سـەرکەوتن لە ژیاندا. ڕۆحی قسـەکە ئەوەیە: وەک چۆن باوەڕ بە کاری جن کپ بوویەوە، باوەڕ بە بەختیش -لە سایەی پێشکەوتنی زانستی و شارستانییدا - ئاوەهای لێ دێت.

تۆ دەڵێیت: تاک لە ژیانیدا لە ڕێگەی بەهرەکانییەوە کە خۆشـی پێیان نازانێت و خەڵکیش پێی نازانن، سەرکەوتن بەدەست دەهێنێـت. ئەوجا ئەم قسەیە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەس!

بەهرەکان، وەک پێشـتریش ئاماژەمان پێدا هەمەچەشـنن؛ هەیانە بەهرەی زیرەکی و هەشـیانە بەهرەی دەرئاسـایین. کێ ناڵی بەهرەی دیکەی هێشتا نەدۆزراوە نەبن؟

بۆ نموونە بەهرەکـانی زیرەکی بەپێی بیردۆزەکەی لێکۆڵەری ئەمریکی (هـاوارد گـاردنەر) حەوت بەش یـان جۆرن. بەداخەوە بە ئەندازەی پێویسـت زانیاریم لەبارەی بیردۆزەکەیەوە نییە. بیردۆزێکی نوێیە و لە سێ ساڵی ڕابردوودا سەری هەڵداوە و بووەتە مایەی هەرا و مشـتومڕی ناوەندە زانسـتییەکان. بەندە شـتێکی لێ نازانم مەگەر هەر ئەوەی لە چەند گۆڤار و ڕۆژنامەیەکدا خوێندوومنەتەوە. چاوەڕێی کتێبەکەی خۆیم بگاتە دەسـتم. ڕەنگە لە گفتوگۆی هەڵقەی داهاتوودا بتوانم لەبـارەیەوە بە درێژ بـدوێم. بە هەرحـاڵ، جۆرەکـانی زیرەکی بەپێی بیردۆزەکە – یـان بەپێی ئەوەی من تێگەیشـتووم- ئـا بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

زیرەکیی لۆژیکیی بیرکـارییـانە؛ بـاشـترین نـاویش لێی بنێین (زیرەکیی ژمێرەیی)ـیە. پێوەرەکانی زیرەکی بە شـێوەیەکی گشـتی بەدەوریدا دەخولێنەوە. خۆشـی لە توانای تاکدا لە بواری خوێندن و فێربوون و بەتایبەتییش بواری زانسـتە سـروشـتی و بیرکارییەکاندا دەبینێتەوە.

زیرەکیی زمانەوانی: ئەمەش خۆی لە توانای تاک لە فێربوونی شیعر و پەخشان و وێژە و دەمهەراشی و وتارویژی و ئەو جۆرە شتانەدا دەبینێتەوە.

زیرەکیی مامەڵە: توانای مامەڵەی تاک دەگرێتەوە لەگەڵ دیگەراندا کە چۆن دڵیان ڕادەگرێ و لە قولاییان دەگا و پاڵنەر و حەزەکانیان دەخوێنێتەوە. ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە عەرەبی ئەوسا پێیان دەگوت (الدهاء) [بە کوردیش دەبێتە لیزانی].

زیرەکیی خودی: ئەمەش تێگەیشتنی تاک لە خۆی دەگرێتەوە لەگەڵ ناسینی توانا و دەسەڵاتە ڕاستەقینەکانی تاکدا. هیچ زیادەڕۆیی چەشنی زیادەڕۆکاران تێدا ناکات. کەمیشی ناکاتەوە وەک ئەو کەسانەی تووشی گرێی کەمکردنەوە بوون.

زیرەکیی وێنایی: ئەمەش خۆی لە توانای تاک لە دانانی شێوە ئەندازەیی و وێنە و نەخشە سەربازییەکاندا دەبینێتەوە. تاک لە ڕێگەی خەیاڵی زیهنییەوە شێوەکان دێنێتە ناو واقیعەوە.

زیرەکیی جوڵەیی: خۆی لە توانای تاک لە هێزی جووڵەی دەست و پێ و ماسولکە و شتانی دیکەیدا -بۆ گەیاندنی مەبەست- دەبینێتەوە. نموونەی نەشتەرگەرێک کە دەستەکانی باش بەکار دێنێت؛ یان یاریزانێکی تۆپی پێ کە قاچەکانی زیرەکانە بەکار دێنێت یاخوود سەماکارێکی بلیمەت.

خۆشمان دەتوانین جۆری هەشتەم بۆ ئەم حەوتە زیاد بکەین، ئەویش زیرەکیی نوکتەیە. دیارە نوکتەگێڕانەوە زیرەکیی تایبەتی خۆی گەرەکە. زۆرجاران خەڵکانێک دەبینین لە زۆر بواری دیکەدا زیرەکن، کەچی لە نوکتەدا هیچ نین. هەشە لە نوکتەدا زیرەکە، کەچی لەوانی دیکەدا زفتە.

کاتێکیش دێینە ســـەر بەهرە دەرئاســـاییەکان، دەبینین ئەمانیش چەشـــنی زیرەکی چەند جۆرێکن. هەرچەندەی لە دەمەوودووەکانی پێشـــوودا باســـمان کردوون، بەڵام کێشـــە نییە لێرەش دووبارەیان بکەینەوە:

بەهرەی دڵخوێندنەوە، ئەمە خۆی لە خوێندنەوەی بیری بەرانبەر یان جێهێشتنی کاریگەری لەسەریدا خۆی دەبینێتەوە.

بەهرەی دووربینی (تیژبینی)، خۆی لە بینینی شـــتان لە دوور یان پشت پەردەدا دەبینێتەوە.

بەهرەی جێگۆڕکێ: گۆڕینی شـوێنی شـتەکان بەبێ دەسـت لێدان. یان بەهرەی زیانگەیاندن بە دیگەران.

بەهرەی خەبەردان لە ڕووداوەکانی داهاتوو.

بەهرەی پێوتن و خەواندن.

بەهرەی بەخۆکردن، ئەمەش خۆی لە خۆزامارکردنـدا دەبینێتەوە بەڵام بەبێ ئەوەی ئێشی پێ بکات و زیانی بگاتێ.

هەرچۆنێک بێت، دەشـــێ تاک بە یەکێکیان بەهرەمەند بێت، یان لە یەک زیاتر. ئەوســـا بارودۆخ و ڕێکەوت یارمەتی دەدەن وەبەرهێنانی تێدا بکات و ســـەرکەوتنێکی گەورە لە ژیاندا بۆخۆی تۆمار بکات. دواتریش خەڵکی بەبێ ئەوەی لەبارەی بەهرەکەیەوە بزانن، لە هۆی سەرکەوتنەکەی دەپرسن و خول خول دەپێچن بە بەختەوە.

بۆ نموونە تەماشـــای یاریزانی بەناوبانگی بەڕازیل (بیللی) بکە. خوای گەورە زیرەکییەکی گەورەی جوڵەیی پێ بەخشـــیوە. پاشـــان بارودۆخ و ڕێکەوتی بۆ هەڵکەوت لە گەمەی مۆندیالی[١٥] تیپی پێدا

---

[١٥] - وشـــەی مۆندیال لە زمانی ئیســـپانییدا بەواتای جیهانی دێت، چونکە وشـــەی مونـدۆ واتە جیهـان و بە پـاشـــگرەکەوە دەبێتە جیهـانی، جـا لە تەلەفزیۆنە

بەشداری بکات و لە هاوڕێکانی باشتر بێت و بەو هۆیەوە ناوبانگێکی گەورەی جیهانی بەدەســـت بێنێت کەس بەدەســـتی نەهێنابێت. کاتێک بەشداری یاری دەکات، سووسەیەکی سەیری نەستییانەی بۆ تۆپەکە هەیە و دەزانێت چۆن لێوەی نزیک دەبێتەوە و چۆنیشـــی هەڵدات و لەکوێشەوە هەڵیدات. بە گوزارشتێکی دیکە: خاوەنی پلەیەکی بەرزە لە زیرەکییەکی دیاریکراو. کێ چوزانێ خاوەنی بەهرەی دیکەش نەبێت وەک بەهرەی خەبەردان لەوەی تۆپەکە لەکوێدا دەکەوێتە سەر زەوی، بۆیە پەلە بکات و خۆی بگەیەنێتە ئەو شوێنە بەر لە گەیشتنی تۆپەکە!

من ئەو کاتانەی تەماشـای کەسـانی سـەرکەوتوو دەکەم، خەریکە بڵێم هەرکامیان خاوەنی بەهرەیەکن شـایەنی سـەرکەوتنی کردوون. لێرە دەبێـت کەســـانێـک لە ڕیز دەربێنین کە بەهۆی نـاوبـانگی خانەوادەکەیانەوە ســـەرکەوتوون، یان میراتی باوانیان، یاخوود لە ڕێگەی خزمخزمێنە و ژێربەژێری؛ ئەوانە بە سەرکەوتووی ڕاستەقینە ناژمێرین لەڕاستیدا، بەڵکوو ئەمانە دەسکردی دەڵاڵەکانن. سوپاسیش هەر بۆ خودایە ئەگەر لەسەر شتێکیش بێ بەدڵمان نەبێ.

گۆڤـار: ئەدەبی کۆنی عەرەبی لێوڕێژی گلەییە لە بەختی ڕەش؛ دەبینین شـاعیران گلەیی لە جەوری ڕۆژگار و تەنانەت وتووشـیانە لە هێر و کەودەن و نەزانەکان بەدبەختترین. ڕای جەنابت لەســـەر ئەم دیاردە باوەی نێو مەیدانی وێژەی کۆنی عەربی چییە کە هێشـــتاکونێ ئاسەواری ماوە؟

دوکتۆر: لەم بـارەیەوە چیرۆکێکی ســـەیر دەگێرمەوە کە خەڵکی عێراق وەک نوکتە بەســـەر زاریدا دێنن و ناوەڕۆکەکەشـی: کابرایەکی پووڵدار دێتە لای جەواهیرفرۆشێک کە نقێم (فص)ــی ئەنگوستیلەکەی لا دانـابوو بۆی زاخـاو بکـاتەوە. گوایە کـاورای پوڵـدار دەموپلێکی

---

وەرزشییەکانی خۆماندا زۆرجار دەبیسترێت دەڵێن: (مۆندیالی جیهانی) کە یەکێکیان زیادەیە و وەسسەلام. وەرگێڕ

ڕەوانی پێوە نەبووە و بە نقێم(فص)ـــــــی وتووە (فش). لەولاوە هەژارێکیش گوێی لێ دەبێ کابرا دەموپلی وایە، ســـەرێ بەرزەکاتەوە و ئەڵێ: خوایە من ئەتوانم بڵێم: فص، فەصـــیص، فوصـــفوص، فەصـــافیص، ئیتر بۆچی منت هەژار و ئەو دەم هینەت دەوڵەمەند کردووە؟!

ئەم چیرۆکە دەمـاودەمی عێراق گەڕاوە و بڵاو بووەتەوە گوایە خودا بە کەســانی ناشــایەنی دەدات. ئەمەش هەر ئەوەیە وێژەوانانی کۆن گوتوویانەتەوە.

شــایەن بە باســـە، ئیبن خەلدوون لە پێشـــەکییەکەیدا تەقەی لە دەرگای ئەم بابەتە داوە و ئەو قسـە باوەی دەورای خۆشـی دێنێتەوە: (خاوەن مەعریفە بەختی نییە؛ ئەو لەوە-لە مەعریفە- بەشی دراوە).

خەلدوون ڕاڤەیەکی شـــیرینی ئەم بابەتە دەکات دەڵێت: خـاوەن مەعریفە فیز بەســـەر مەردوومدا لێ دەدات و دڵدارییان ناکات، لە کاتێکدا کەسی ئاسایی خۆی هەڵدەواسێ و چەورەیی بۆ دەسەڵاتداران و زەنگینان دەکات و ئەوانیش بە چەپ و ڕاستدا پێی دەبەخشن.

ئەم تەفسـیرە خەلدوونییە خاڵی نییە لە هەقیقەت، هەرچەند هەموو هەقیقەتیشـــی لەخۆی بار نەکردووە. دەبێ بیریشـــمان بێ خەلدوون شـەش سـەدە پێشـتر ژیاوە. خەتای نییە ئەگەر ئەو زانستەی ئەمڕۆی پێ نەگەیشـتووە و خوێ،دنەوەکانی لەمەڕ بەهرە هەمەچەشـنەکان لە ژیانی خەڵکیدا بەرچاو نەکەوتووە.

پێشـــتر وتمان دەشـــێت تاک لە بوارێک لە بوارەکانی ژیـاندا ســـەرکەوتن بەدەســـت بهێنێت، کەچی لەوانی دیکەدا گێلەی بێت. هەر خۆشـــمان چیرۆکی بازرگانە زیرەکەکەمان هێنایەوە کە لە هەندێک هەلوسکەوتی دیکەدا گێلی بەرۆکی گرتبوو، کەچی توانای خوێندنەوەی بیری کڕیارەکانی هەبوو یان دەیتوانی کاریگەری لەسەر بیریان دانێت.

یان توانای پێشـــبینی هەبوو و دەزانێ کەی نرخ بەرز و نزم دەکات. یان لێزانە و دەزانێت چلۆن کڕیارەکانی کەمەنکێش دەکات و لە پاڵنەر و هەوەسەکانیان دەگات و لەگەڵیاندا هەنگاو هەڵدێنێت.

خاوەنی (فش)ـــەکە، ئەوەی تۆزقەڵەیەک لەمەپێش غەیبەتمان کرد، نەیدەتوانی جوان بدوێت، کەچی ڕەنگە لە لایەنێکی دیکەوە بلیمەت و بەهرەیەکی شاراوەی هەبێت. ڕاستییەکەی لە نموونەی ئەم کەسەمان زۆر و زەوەندە و ڕۆژانە لێرە و لەوێ دەیانبینین.

نوختەیەکی دیکەی گرنگیش هەیە کە دەبێت ئاماژەی بۆ بکرێت: شـــکات لە جەور و ســـتەمی ڕۆژگار تەنها تایبەتی ویژەوانان نییە. ڕاســـتییەکەی هەموو کەســێک کەم تا زۆر شــکاتی ڕۆژگاری خۆی دەکات. گش کەسێ لەوە زیاتر کە هەیە خۆی دەبینێ و لای وایە لەوە کەمتری پێ دراوە کە دەبوو بیدرێتێ. ڕەشـــەخەڵک و نەخوێندەواران لە ئەدیبان کەمتر پرتەوبۆڵە ناکەن؛ هێندە هەیە ویژەوان زمانپاراوە و بە هونەرەوە گلەییەکانی خۆی دەکات و دنیا پڕ لە گلەیی و گازەندە دەکات. هەرچەند لە دنیا هەڵکشـێن، چاویان لە پلەی بەرزترە و جامی تورەییـان لە دنیـا پڕتر دەکەن و بە تورەییەوە پێی دەڵێن دەبوو زۆرترمان بدەیتێ و ئەوە چییە ئەو گشـتەت بەو هیچنەزان و گەمژانە داوە!

## خورافه نا، به‌ڵکوو ئه‌مانه ده‌رئاسان

(گۆڤاری التضامن، ٢٧/ ٩/ ١٩٨٦، ژماره ١٨١)

ئایا (توانای ده‌رئاســـــای جوڵێنه‌ر) هه‌یه له مرۆڤدا که نه‌توانێت نهێنییه‌کانی بدۆزێته‌وه؟

چیرۆکی زۆر له‌م باره‌یه‌وه هه‌ن و پاڵه‌وانه‌کانیشـیان ڕاسـته‌قینه‌ن؛ یان له جیهانه‌که‌ی دیکه‌ی جگه کۆمه‌ڵگه‌ی عه‌ره‌بی (مه‌یدانه چره‌که) بۆ ئه‌م چیرۆکانه، به‌ڵکوو بگره کۆمه‌ڵگه ڕۆژئاواییه‌کانیش!

ته‌نانه‌ت به‌شـێکی (بڕوای گشـتی)ـــــیشـی پێک هێناوه و خه‌ڵک به وریایی و ترسێکی زۆره‌وه مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵ ده‌که‌ن.

ئه‌گه‌ر کۆمه‌ڵگه‌ی عه‌ره‌بیی خۆمان هێشـتاش سـه‌ره‌وکاری له‌گه‌ڵ ده‌رئاســـا و نهێنییدا هه‌بێت، یان ئه‌وه‌ی تێی په‌ڕاندبێت و گه‌یاندبێتییه ناو چه‌ند کتێبێکی دیاریکراو و وتارگه‌لێکی ساده و هه‌واڵه‌کانه‌وه، ئه‌وا کۆمه‌ڵگه‌کانی دیکه گه‌یاندوویانه‌ته نێو تاقیگه زانســـتییه‌کانیانه‌وه و له سۆنگه‌ی (دیگای زانستی)ـیه‌وه ته‌ماشای ده‌که‌ن و هه‌وڵی ده‌رخستنی نهێنیی پشـتیان و ئه‌و توانا شـاراوانه ده‌دات که بۆ زانسـتی هاوچه‌رخ وه‌گه‌ڕخستنیان ئاسان بێت.

دوکتۆر وه‌ردیش قســــه‌کـانی ده‌گه‌یه‌نێته ئه‌م چوارچێوه‌یه و هه‌رچه‌نده زۆرێکیش له قســــه‌کـانیدا پشـــتی ده‌گرن، که‌چی ئێمه ڕاهـاتووین ئه‌م بـابه‌تـانه بخه‌ینه نـاو عه‌مبـاری خورافه‌وه؛ ئه‌وه‌ی که گیـانه زانســــتییه‌که‌مـان گـاڵته‌ی پێ ده‌کـات. به‌ڵام دوکتۆر وه‌ردی له چوارچێوه کۆمه‌ڵایه‌تییه‌که‌وه ته‌مـاشـــای ده‌کات – به‌و پێیه‌ی خۆی کۆمه‌ڵناسـه– و له په‌نا ئه‌وه‌شـدا له گۆشـه‌ی چوارچێوه زانسـتییه‌که‌وه

– بەو پێیەی گرنگی بە زانستە هاوچەرخەکان دەدات. ئەو زانستی پاراسایکۆلۆجییەش کە خۆی ناوی لێناوە دەرئاساناسی، زۆرترین دەنگوباسی لەم سەردەمەدا خستووەتە دیوان.

قسەوباسەکەمان لەگەڵیدا بوویە دوو بەش:

- بەشی خورافە، وەک ئەوەی لە واقیعدا و لە ڕووی باوەڕبوون بە دەرئاساوە باوە.
- بەشی زانست – وەک ئەوەی دوکتۆر دەیەوێت بچینە ناو ئەوەی بە خورافەی ناو دەنێین- ئەوەی پێشتر کتێبەکەی بەناوی (دەرئاساکانی نەست)ەوە داناوە.

لە دەبیستین کەسانێک شتانێکی مادی تەنها لە ڕێگەی سەرنجدانەوە دەجوڵێنن، ئێمەش لێیان دەپرسین: ئایا ئەو شتەی دەیکەن لە ئەنجامی دەستی شاراوە یان فێڵبازی –وەک ئەوەی زۆرێک جەختی لەسەر دەکەنەوە- یان لە هێزێکی دەروونییەوە دەردەچێت کە خاوەنەکانیان توانایەکی گەورەیان لە هێزی پێشگۆیی (التنبؤ) یان هەر هێزێکی دەرئاسای دیکەدا هەیە کە زانستی دەرئاساناسی ئێستا لێی دەکۆڵێتەوە؟

زۆربەی ئەو کارە سەیرانەی لە سەکۆ (مسرح)ەکاندا نمایش دەکرێت، لەو جۆرانەن کە پشت بە دەستی شاراوە و فێڵبازی دەبەستن کە ئەوەش هونەرێکە و کەسانی شارەزای خۆی هەیە. لەم ئاخیروئوخرانەدا کتێبێک دەرچووە هەموو هونەر و فرت و فێڵ و یاری و گەمەکانی باس کردووە کە لەسەر تەخت بۆ پێکەناندنی بینەران و دڵخۆشکردنیان ئەنجام دەدرێت.

**گۆڤار: بەڵام هەشە ئەم وەسفەی بەسەردا جێبەجێ نابێت و خاوەنی هێزێکە کە دەکرێ بە دەرئاسا بژمێردرێت؛ وەک جوڵاندنی**

**شـــتان. ئەوان خۆشـــیان نازانن لەکوێی خۆیانەوە هەڵدەقوڵێت و سـەرچاوەی گرتووە. ئەمان لەو کەسـانە جیاوازترن کە ئێوە باسـیان دەکەن. زانایان گرنگییان بە لێکۆڵینەوە لە کارەکانیان داوە وەک چۆن گرنگییان بە کارە دەرئاساکانی دیکەش داوە.**

دوکتۆر: ئەوە ڕاســتە و واقیعیشـــە. بەڵگە و نموونەی زۆریش بۆ پشتگیری ئەو قسەیەی جەنابت هەن:

لە سـاڵی ١٩٧٢، ئێسـتگە هەواڵییەکان باسـی کابرایەکی بەریتانییان بەنـاوی (یۆری میللەر) کرد کە توانـای جولانـدنی بزمـار، چڵاک[١٦] و کلیل تەنها لە ڕێگەی سەرنج گرتنەوە هەبوو. هەندێ لە کارەکانیشی لە تەلەفزیۆنی بەریتـانیـادا نمـاییش کرا و، (لیژنەی توێژینەوەی دەروونی) لە لەندەن دانیشتنێکیان بۆ پشکنینی ئەنجام دا.

لە ڕووسیاش ژنێک کە لەم هێزە دەرئاسایەی بەش درابوو بەناوی (نیلیا میخائیلۆفا) وەدیار کەوت، ئەمیش دەیتوانی بەبێ دەســـتدان لە شـــتەکان، بیانجولێنێت. لە بەهاری ١٩٦٨دا ئێزگەی هەواڵەکانی جیهان باســیان کرد و وتیان: کاتێک شــتێکی پێویسـت دەبێت، هێندە بەســە تەمـاشـــای بکـات، ئیدی شـــتەکان بەرەولای دەخشـــێن. ئێزگەی (ئەسـۆشـییەتید پرێس) ڕوونکردنەوەیەکی ڕۆژنامەوانی لە مۆسـکۆوە بڵاو کردەوە و تێیدا هـاتبوو: (نیلیا میخـائیلۆفیا زانـایـانی ســـۆڤیەتی توشی سەرسوڕمان کرد کە بەبێ دەستلێدان پاکەتە شقارتە و کاسەی شەرابی دەجولاند).

**گوڤار: ئایا ئەوە ڕای گشت زانایانی سۆڤیەت بوو؟**

---

[١٦] - عەلاگەی جل هەڵواسین.

دوکتۆر: نە... بەڵکوو ڕێک دەرهەق بە میخائیلۆفیا بوونە دوو بەرەوە؛ بەرەی زانایان و بەرەی مارکسییەکان. زاناکان دەیانویست توێژینەوەی لەسەر بکەن و درێژەی پێ بدەن بەبێ ئەوەی ئایا دەکرێت تەفسیرێکی ماددی بۆ بکرێت یان نا؛ لە بڕوای ئەماندا زانست لە پەرەسەندنێکی بەردەوامدایە. ئەوەی ئەمڕۆ نەتوانین ڕاڤەی بکەین، سبەی و دووسبەی دەتوانین.

بەڵام مارکسییە توندەکان هەڵوێستێکی دیکەیان هەبوو؛ ئەوان بەتەواوی وابەستەی دەقە مارکسییەکان بوون و دژی هەر دیاردەیەکیش ڕادەوەستان کە نەتوانرێ ڕاڤەیەکی ماددی بکرێت و دەیانخستە چوارچێوەی بابەتە غەیبی و ڕۆحییەکانەوە کە دەبنە مایەی تێکدانی عەقڵ و بەربەستی بەردەم پێشکەوتن.

**گۆڤار: ئەی لە ئەنجامدا چی ڕوویدا؟**

دوکتۆر: هەر لەو دەمودەستەی هەندێک لە زانایانی ڕووسیا خەریکی لێکۆڵینەوە بوون لەسەر (نیلیا)، کۆمەڵێک لە دەمارگیرە دەقییەکان خەریکی دژایەتی بوون. هەندێکیان ناوبراویان بە جادووگەری فاڵگرەوە ناو برد، هەندێکی دیکەشیان دەیانگوت: موگناتیسی لە لەشی بەستووە.

ئەدی لە حوزەیرانی ١٩٦٨، لە مۆسکۆ کۆڕبەندێک لەبارەی زانستی دەرئاساناسی بە ئامادەیی توێژەرانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەسترا. توێژەران دەیانویست چاویان بە نیلیا بکەوێت و هەندێک ئەزموونیشی لەگەڵدا بکەن؛ کەچی نیلیا دیار نەما و کەس نەیتوانی پەیوەندی لەگەڵدا ببەستێ وەک ئەوەی زەوی قووتی دابێت. بۆخۆی ڕۆژنامەی (براڤدا)ـی زمانحاڵی حیزبی شیوعیی سۆڤیەتی وتارێکی توندی لەدژی هۆنییەوە.

**زانایان... چییان له نیلیادا دەبینی؟**

بۆ نموونه دکتۆر سێرگێف که یەکێکه له زانا سەرگەرمەکانی مەیدانی دەرئاسانــاسی، له هەوڵدایه ڕاڤەی کارەکانی نیلیا بکات؛ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە که دەماخی ئەم کچه لەرەلەری زۆر بەهێزی کارۆموگناتیسی دەنێرێت؛ ئەو لەرەلەرانەش دەبنه هۆی جوڵاندنی شتەکان -بەبێ دەست لێدان. سێرگێف ئامێرێکی بۆ پێوانی لەرەلەری مێشکی مرۆڤی دروست کردووه و تێگەیشتووه که کاری پێوانەکردنی ئەو شەپۆله دەرچووانەیه. تێشگەیشت که ئەو لایەی مێشک که کۆنترۆڵی چاو دەکات دەتوانێت لەرەلەرێک بنێرێت که سێ هێندە و چوار هێندەی لاکەی دیکه بەهێز بێت. ئەو دەمەشی که سێرگێف بەراوردی شەپۆلی دوو لاکەی دەماخی نیلیای کرد، بینی پەنجا ئەوەندەی لاکەی دیکه بەهێزە!

**لێرەدا باسی (چاوکردن) هات به خەیاڵمدا.. ئەگەر ئاوەها بێت، ئەوە مانای ئەوەتانی (چاوکردن)ـیش که ئێمه به خورافەی دەزانین، بنەمایەکی زانستیی هەیه؟**

دوکتۆر: دەشێ بوترێ: چاوکردن له هەندێک ڕووەوە بنەمایەکی زانستیی هەیه. کەسانێک هەن تەماشای هەر کەسێک بکەن و سەرسامیی خۆیانی بۆ دەربڕن، زیانی پێ دەگەیەنن. بەڵام ئەم جۆرە کەسانه زۆر کەمن، یان دەگمەنن وەک دەگمەنیی خاوەن دەرئاساکانی دیکه.

نابێت بیریشمان بچێت چاو له دێرزەمانەوە لەناو مرۆڤدا باسی کراوە. چیرۆکیشی بەناو زۆرێک له نەتەوەکاندا بڵاو بووەتەوە و مەردووم له ڕێگەی چاوەزار و نزاوە خۆیانی لێ پەنا دەگرن. ئێستاشی بەدەمەوە بێت ژنی نەوەی پێشوو هەن که پۆشاکی

منداڵەکانیان بە چاوەزار و نزا دەڕازێننەوە تا لە چاوی بەد خودا بیانپارێزێت؛ یان ئەوانەی خانووی تازە بنیات دەنێن، تاکە نەعلێکی بچوک یان ناڵی ئەسپ بە سەر دەرگاکەوە هەڵدەواسن تا لە چاوی بەد پارێزراو بن.

هەروا لە یەکێک لەو خەڵکە ئاساییەم پرسی هۆی چییە نەعل یان ناڵ بە سەر دەرگاوە دەدەنێن، وتی: چاوی خەڵکی بە نەعل و ناڵەکەوە مەشغوڵ دەبێت و خانوو و خاوەنەکەی بیر دەچێتەوە و ئیدی ئێرەیی نابا و چاوی لێ ناکا.

دوکتۆر تێبینی لەسەر ئەم باسە دەدات و دەڵێت:

کێشەی ڕەشەخەڵک جاران و ئێستاشی بەدەمەوە بێت وا دەزانن هەموو کەسێک دەتوانێت چاو بکات، بۆیە حەزیان لێی نییە کەس بەچاوی سەرسامییەوە تەماشای خۆیان یان ماڵ و منداڵیان بکات نەبادا چاوی کاریان لێ بکات. تەنانەت کار گەیشتووەتە ئەوەی ئەگەر یەکێک وەسفی منداڵی یەکێکیان بکات، خێرا دەست بە (قل أعوذ)ـەکان دەکات بەسەر منداڵەکەدا تا خوا لە چاو پەنای بدات.

ئەوەی توانای چاو کردنی هەبێت- ئەوەی لە زمانی کوردیدا پێی دەڵێین چاوپیس- هەر کە تواناکەی تێدا دەرکەوت، خێرا هەواڵی لەناو خەڵکیدا بڵاو دەبێتەوە و مەردوومیش لێی دەسڵەمێنەوە و لێی ڕا دەکەن.

هەر بۆ خۆشی لێرەدا باسی بکەم: لە چەند دە ساڵێک لەمەوبەر بیستم کابرایەکی چاوپیس نیشتەجێی یەکێک لە شارەکانی عێراقە؛ نیازم کرد بچمە سەردانی تا کەمێکی لێ بکۆڵمەوە، کەچی لە کۆتا ساتدا بڕیارم گۆڕی و ترسام لەوەی چاوم لێ بکات -والعیاذ باللە!

گۆڤار: ئایا ئەم شتەی باسی دەکەن پەیوەندییەکی بە دەرئاساوە هەیە ئەوەی هەندێک کەس پێی هەڵدەستن؟ دیاریشە کۆمەڵێکیان لە هیند و ئەوروپا دەنگوباسیان بڵاو بووەتەوە!

ئەوەی یۆگاییە هیندییەکان پێی هەڵدەستن و سەر دەئاوسێنن، هیچ ڕاڤە و لێکدانەوەیەکمان پێ شک نابرێت. هەندێ لەو یۆگاییانە چوونەتە پایتەختە ئەوروپییەکان و بەتایبەتییش لەندەن و بە کارەکانیان دنیایان وروژاندووە. زانایانیش بەدواداچوونیان بۆ کارەکانیان کردووە و لەوسەرەوە بێجگە لە سەرسوڕمان و چاوەڕێکردنی داهاتوو – کە بەشکوو شتێکی هەندەکی یان هەمەکییان بۆ ڕوون بێتەوە- هیچی دیکەیان شک نەبردووە.

### ئایا ئێستا حاڵەتی دیاریکراوت لایە؟

لە ڕۆژئاوا سێ کەس دەرکەوتن و بوونە مایەی هەرا و هۆریایەکی زۆر، هەرچەندە نەگەیشتنە ئاستی یۆگاییەکانی هیندوستاندا؛ ئەوانیش (بلادینیۆ)ـی ئیتاڵی و (هۆدینی)ـی ئەمریکی و (هۆم)ـی سکۆتلەندی. سێهەمیشیان وەک نموونەی ئەوانی دیکەش وەرگرین بەسە:

هۆم لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەدا ژیاوە. ناوبانگی بەوە داخستبوو کە بەبێ دەستلێدان شتەکان دەجووڵێنێت. بێجگە ئەوەش، بەسەر هەوادا لەنێوان دوو پەنجەرەی باڵەخانەیەکی بەرزدا بڕوات و، دەموچاوی بخاتە ناو پشکۆی داگیرساو و، هەندێک ئامێری مۆسیقا لەخۆیانەوە بخاتە ئاواز.

ئەوەبوو زانکۆی هارڤارد چوار لە ئوستازەکانی خۆی بەمەبەستی تاقیکردنەوە هەناردە لای ناوبراو؛ ئەوانیش ڕاپۆرتی خۆیانیان نوسی. تێیدا نوسیبوویان: ئەو پیاوە هەڵنەستاوە بە ئەنجامدانی هیچ کارێک بەمەبەستی چاوبەست یان فێڵ لێکردنیان. لەنێوان ئەو زانایانەشی کە

چووبوون، ویلیەم کرۆکس هەبوو کە لە تـاقیگە تـایبەتەکەی خۆی چەنـدین ئەزموونی لەگەڵی تۆمـار کردبوو؛ دواتریش وتـارێکی بۆ یەکێک لە ڕۆژنامەکان نووســـی و ئەمەش بەشـــێکی دەقاودەقێتی: (هەموو ئەوانەی بینیم، گشـتیان لەبەر ڕوناکیدا ڕوویاندا. یەک دنکەش خاوەخاو ناکەم لەوەی شـایەتی بدەم ئەوانەی بینیم تەواو پێکنەسـازن لەگەڵ بنەما زانســـتییە دانپێدانراوەکاندا وەک یاســـای کێشـــکردن کە ڕەهایانە کاریگەریی هەیە و... هەر بەڕاستی لە کەللەمدا کێشمەکێشێک پەیدا بووە لەنێوان ئەو شتانەی عەقڵم قەبووڵیان ناکەن و ئەو شتانەی کە بە چاو و دەســـتم بینیومن و دەســـتم لێداون و ناتوانم بەدرۆیان بزانم).

ئەوەی ئەو باســـی دەکات، وامـان لێ دەکات نەتوانین جیاوازی لەنێوان شــتە مەعقول و نامەعقولەکاندا بکەین لە ژیاندا. واشــمان لێ دەکات بڕوا بە قسەی (دێوخانە)ەکان بکەین کە دەیگێڕنەوە و عەقڵیش پێی قەبووڵ ناکرێت! ئەو شوێنانەی بڕوا وایە دێو و شتی تێدایە!

بەڵام خۆ دێوخانە هەر لای ئێمە نییە، بەڵکوو لە گشـــت جیهاندا هەیە؛ چ وڵاتی پێشـــکەوتوو، چ دواکەوتوو. (دێوخانە)ـــــەکان لە بەریتـانیـادا نـاویـان دەرکردووە و وایـان کرد (کۆمەڵەی توێژینەوە دەروونییەکان) و هەندێک زانکۆی بەریتانیا هەســـتن بە پێکهێنانی لیژنەی بەدواداچوون بۆ ئەم بابەتە و، کتێبی باشـــیش لەم بارەیەوە نوســـراون... چیرۆکی زۆریش لە جێگە جیـاوازەکـانی جیهـانەوە نوسراونەتەوە و کۆکراونەتەوە.

## نموونەیەکمان دەدەیتێ؟

ڕۆژنامەی (العراقیة) لە گۆڤاری (الأهرام)ـــی میسـرییەوە سـاڵی ١٩٥٣ چیرۆکی دێوخانەیەکی ئەســـکەندەرییە دەگێڕێتەوە کە لە کاتی

خۆیدا هەرای زۆری لە میسر ناوەتەوە. بەندە هێشتا ئەو چیرۆکەم لەبەر ماوە کە ڕۆژنامە عێراقییەکە باسی کردبوو. ئەو دەمەشی چوومە وڵاتی هەرەمەکان، زانیاریی زیاترم لەبارەیەوە کۆکردەوە و پوختەکەشی: پارێزەرێک بەناوی (ئیسماعیل نەجم) لە یەکەیەکی ناوچەی (الأزاريطة)ی ئەسکەندەرییە نیشتەجێ بوو. لە شەوێکی ئەیلولی ساڵی ١٩٥٣، لەو دەمەی خۆی و هاوسەرەکەی لە ژووی نوستنەکە بوون، هەستیان بە جووڵەیەکی نائاسایی لە داڵانەکەدا کرد. هەروەها هەستیان کرد دەستێک بەتوندی کێلوونی دەرگاکەی گرتووە و دەیەوێ بە فشار بیکاتەوە هەرچەندە لەم دیوەوە کلیل درابوو. هەستان و کەوتنە سۆراخی بزانن کێیە، کەچی هیچیان دەسکەوت. کە هاتنەوە جێخەوەکەیان، هەمدیس تەق و هۆر دەستی پێ کردەوە. ئەم کارە چەند شەوێکی دیکەش بەردەوام بوو؛ گۆڤاری (الأهرام)یش وتەی نوسەری بەناوبانگ (ئەحمەد صاوی) لە ستوونی خۆیدا بە ناونیشانی (ما قل ودل: کەم و بەمەبەست) وەک مەسخەرە نوسیبوو لەبارەی چیرۆکی دادوەرەکەوە و بە خورافەی جنۆکە و بەرئاگردانی هەژمار کردبوو!

لە ساڵی ١٩٥٦ش نوسەری بەناوبانگ سەلامە موسا کتێبێکی بەناونیشانی (لێکۆڵینەوە دەروونناسییەکان: دراسات سایکۆلۆجییە) دەرکرد و تێیدا ئەم چیرۆکەشی باس کردووە و بەدەم مەسخەرەوە دەڵێ با بچینە ئەو یەکەیە و دەوری و قاپی شکاو ببینەوە و لەوێ پارچەی قاپی شکاویان بینییەوە؛ هەروەک چۆن پارچەی گوڵدانێکیان دۆزییەوە کە نرخی لە حەفتا جونەیهدا خۆی تن کردووە کە پارچەکانی دیکەی بە چوارقوڕنەی جیهاندا بڵاو بووەتەوە و پژاوە.

سەلامە موسا نکۆڵی دەکات ئەم کارانە هیی دەستێکی دەرئاسا بن و دەیهەوێت ڕاڤەیەکی فرۆیدییانەی بۆ بکات. ئاشکرایە سەلامە موسا یەکێکە لە یارانی قوتابخانەی دەروونشیکاری. لە ڕاڤەکەیدا دەڵێت:

ئەوە تووڕەییەکی گەورەی کەبتکراوی دەروونی خۆیەتی کە لە ترسی قسەی خەڵکی سەرپۆشی بەسەردا داوە. بەڵام ئەو ڕقە زۆرەی لە کاتی خەوندا قوڵپی داوە و هەستاوە و دار و نەداری ماڵەکەی- بەو شێوەیەی ئێمە لە ئاگاییدا تووڕە دەبین- تێک شکاندووە...

**ئەی تۆ ڕات لەسەر ئەو تەفسیرە چییە؟**

ئەم تەفسیرە فرۆیدییە بۆ دێوخانە لە ئەسکەندەرییە بۆ نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیە ڕاست بوو، بەڵام چیدی لەگەڵ ئەم سەردەمەی ئێستاماندا پێک نایەتەوە.

**چۆن؟**

چونکە دێوخانە بووەتە حەقیقەتێکی حاشاهەڵنەگر. بەڵام ئەو ڕووداوە نامۆیانەی کە تێیدا ڕوو دەدەن، هەڵیان دەگرین بۆ داهاتوو. زانست لە پەرەگرتنی بەردەوامدایە. ئەوەی ئەمڕۆ بە ئەستەم لەقەڵەم دەدرێ، ئەگەری هەیە سبەی ببێت.

## ئەوەی بکۆشێ، ئەنۆشێ... ئەگەر بەهرەی هەبێت

(گۆڤاری التضامن ١/ ٨/ ١٩٨٧، ژمارە ٢٢٥)

پاش ئەو شــــەرح و شــــرۆڤە باشــــەی دکتۆر لەبارەی "بەخت و ڕێکەوت لە ژیاندا" پێشــــکەشــــی کردین... و لەبارەی ڕوونکردنەوەی ســــەرکەوتن یان ســــەرنەکەوتنیان... ئێســــتا ئەم کۆمەڵناســــە گەورە عێراقییە، لە ژمارەی ئەمجارەی (التضامن)دا، باسی هەقیقەتی کۆشش دەکات و ئەو پەندە باوەش دێنێتەوە کە دەڵێت (من جد وجد) (کێ بکۆشــــێ دەنۆشــــێ) یان ئەوەی بکۆشــــێ، دەســــتی دەکەوێت و دەیدۆزێتەوە و، (کل من ســــار علی الدرب وصــــل) (کاروانی ســــەر ڕاســــتەڕێ ، دەگاتە مەقســــەد). ئەمانە قســــەگەلێکن بۆ هاندان و ورەبەخشــــین و بەردەوامی لە کــارکردن؛ بەڵام ســــودی ئەمە لە چوارچێوەیەکی ســــنووردارداپە و زۆرکات کە لە ســــنووری خۆی دەردەچێت و دەبێتە زیانباری.

لە هەڵقەی پێشــــوودا وتت بۆ ســــەرکەوتن، دەبێت ســــێ هۆکار لە کەسەکەدا جەم بووبنەوە؛ واتە بۆ ئەوەی بگاتە بەختی خۆی، ئەوانیش: **بەهرە، دۆخ و ڕێکەوت**. ئەی دەوری تێکۆشان و بەردەوامی و ئیرادە؟ چما ئەوانە ڕۆڵیان لە سەرکەوتنی تاکەکاندا نییە؟

شــکی تێدا نییە کۆشــش گرنگە بۆ ســەرکەوتنی ژیان، وەلێ خۆی بەتەنها بەس نییە. ئەگەر خودا هێزی کۆشــــش و هەوڵی بە یەکێک بەخشــــیبوو بەبێ بەخشــینی بەهرەی پێوســــتی بووارەکە، ئەوە دیارە ئەوە ماندوویەتی و بەدبەختییەکی بێکۆتای لەچارە نوسیوە.

هەر لە دێر زەمانەوە باوە دەڵێن ئەوەی بکۆشێ دەنۆشێ و ئەوەی ڕێگەیەک بگرێت دەگاتە مەنزڵ و ئەو جۆرە فەرمایشــــتانە. ئەمانە

تێکڕایان بۆ ورە بەخشین و هاندان و کارکردنی بەردەوامە. ئەمانە بۆ ئاراستەکردنی نەوەی نوێن لە سنوری دیارکراوی خۆیدا... بەڵام زۆرجار دەبێتە مایەی زیان کاتێک لە سنووری خۆی دەردەچێت...

دەبێت بزانین کەس ناتوانێت لە کاروبارێکدا سەرکەوێت ئەگەر بەهرەی نەبێت، ئیدی با شەو تا بەیانی خۆی بڕەتێنێت... ئێمە ئەو کاتەی داوا لە تەمبەڵێک دەکەین نمرەی بەرز لە تاقیکردنەوەکاندا بهێنێت، وەک ئەوە وایە بە کەسێکی زەعیف (قوپاو) بڵێین دەبێت لە پاڵەوانی زۆراندا یەکەم بیت... یان لە دەنگ زیکنێک ببێتە گۆرانیبێژێکی بەناوبانگ...

لەناو نەوەی پێشووماندا بنەمای (ئەوەی تێکۆشێ دەنوشێ) باو بوو... ناو کتێبەکانی پڕ کردبوو... ئامۆژگارییەکان لێوانلێو بوون لەو قسانە. هەمووان ئیمانێکی یەقینییان پێ هێنابوو. کەچی ئەنجامی دەروونی و کۆمەڵایەتیی زۆر خراپی لێ کەوتنەوە و چەندان کەسی تێدا فەوتا و بوویە قوربانی.

بەندە کاتێک بیر لەو پەروەردە هەڵەیەی دەورانی منداڵیی خۆمان دەکەمەوە، تێری دڵم زووخاو و خەفەت دەخۆم و ئازاریش دەچێژم. باوان و سەرپەرشتیارانی نەوەی پێشوو، بڕوایان وابوو چۆنیان بوێت دەتوانن تاک دابتاشن و ئەم قسەیەشیان لەسەر بنەمای (کێ بکۆشێ دەنۆشێ) دەکرد. بەمەش خراپەیان لەگەڵ کۆمەڵگەکەی خۆیاندا دەکرد. وا گومان دەکەن هێشتاش زۆرێک لە باوان و سەرپەرشتیاران هەر لەسەر ئەو ڕێوڕەسمەن.

لە خراپترین زیان کە لە کۆمەڵگە و شارستانییەت دەکەوێت ئەوەیە باوان منداڵەکانیان بەرەو پیشەیەک دەنێرن کە هیچ بەهرەیەکیان تێیدا نییە. ئەمە لە لایەکەوە دەبێتە خراپە و لەلایەکەوە لەکیسچوونی بەهرە و زۆربوونی تاوان و لادان لە کۆمەڵگەدا.

لەوانەیە ئێرە بۆ چیرۆکی ئەو قوربانییە باش بێت کە خۆم لە نزیکەوە بەباشی دەیناسم و کوشتەی دەستی بنەمای (من جد وجد)ـە!

چیرۆکی ئەم کابرایە هی سییەکانی ئەم سەدەیەیە کە لە دەرس و دەوری قوتابخانەدا، کەودەنی وەک خۆی کەم بوو... ئەوساش دەرس و قوتابخانە هۆی پلەبەرزبوونەوە و بەدەستهێنانی پیشەی دەوڵەتی بوو. دیاربوو دامەزراندنی دەوڵەتیش جێگەی تەماحی نەوەی نوێ بوو... گشتیان حەزیان لێبوو ببنە ئەفەندی و دەستیان بۆ درێژ راداشترێت. دایکیشی لەخوای داوابوو کوڕەکەی ببێتە ئەفەندی تا لەناو ژنانی گەڕەکدا خۆی پێوە هەڵکێشێت... ژنێک بوو حەزی لە فیز و پۆز و پێگەی بەرز بوو لە کوچەکەی خۆیاندا. بەرگەی ئەوەشی نەدەگرت منداڵی ژنانی تر لە ژووررووی هی ئەمەوە بن... کاتێک بینی کوڕەکەی لە خوێندندا فسی داداوە، دەستی بە لۆمەکردنی کرد و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر سەرکۆنەی دەکرد: (ئەی تەوەززەل... خەمتە منداڵی خەڵکە بەیەکەم دەرەچێت... باشە لەچیت کەمە؟)

ماڵی ئەو داماوە ببوویە جەهەندەمێک ئەوسەری دیار نەبوو... ئەو دەیوست ئەوەی ئەمیش وەک هی خەڵکی سەرکەوتوو بێت، کەچی هەستی دەکرد ناتوانێت بگاتەوە بەواندا... تا زیاتر لۆمە بکرایە لەلایەن دایکییەوە، گڕی دەروونییەکەی زیاتر دەبوو. کێشەکەی لەوەدابوو نەیدەتوانی دان بە بێتوانایی خۆی لەو بووارەدا بنێت. نەیدتوانی دان بە ئاستی نزمی زیرەکیی خۆی لە قوتابخانەدا بنێت. دایکیشی لە مانای زیرەکی و بەهرە هەر تێنەدەگەیشت.

ئەویش وەک گشت ژنانی دیکە، وای دەزانی مادەم ڕۆڵەکەی لە ڕووواڵەتدا لە منداڵی فلان و فیسار دەچێت، ئەوا دەبێت بتوانێت بگاتە ئەو پێگەیەی ئەوانی پێ گەیشتووە. هەر خۆی لەبەر خۆیەوە دەیوت: بۆ مەگەر ئەوان چییان لەم زیاترە؟

ئەو کابرایە بەسەر خۆیدا دەنووورایەوە و لە ڕێگەی خەونەوە ئارەزووەکانی تێر دەکرد. واتە چووبوویە جیهانی شێتی. واتە خۆی لێ ببوو بە پاڵەوانێک کە خەڵکی نرخی نازانن... تا دایکی زیاتر سەرکۆنەی دەکرد، ئەویش زیاتر دەچوویە جیهانی وەهم و خەیاڵ. ڕۆژێکیان هەروا بەدەم ڕێوە بینیم هامۆشۆی دەکرد، دەنگوباسم لێ پرسی؟ دەستی کرد بە باسی پاڵەوانیی خۆی و بیرۆکە بلیمەتییەکانی کە چۆن داگیرکەر لێی دەترسێت و خەڵکی لێ هان دەدەن... دەیگوت سیخوڕەکان لە گشت لایەکەوە دەورەیان داوە... نەیارانیش دەسیسە و پلانی لە دژ دەگێڕن. . . دواتر لە ئەنجامی ئەو گشتە ئازار و خەمە سەری نایەوە- خودا بەڕەحمەتی بکا!

مەرج بوو ئەم کەسە و هاوشێوەکانی جۆری بەهرە و پلەی بەهرەکەیان بزانیایە تا لەو بوارەدا هەوڵی خۆیانیان بدایە. بەڵام ئەوان کوشتەی دەستی ئەو چەمک و تێگەیشتنە هەڵانە بوون کە هێشتاش لە کۆمەڵگەکەیاندا باوە. ئەوان سەرلەبەری ژیانیان لەپێناو بنەمای (ئەوەی تێکۆشێ دەنۆشێ) سەرف کرد، کەچی کۆتایی ژیانیان دارمان و فەشەل بوو!

زۆرکات کۆمەڵگە ستەم دەکات بەبێ ئەوەی بزانێت ستەمی کردووە! ئەوجا ستایشی خاوەن زیرەکیی بەرز زۆر دەکات و دەیانبات بە ئاسماندا و ئەوانەش زیرەکیی کەمیان هەیە، تانە و تەشەر بەشیان دەبێت... لەو وایە ئەمانە خۆیان بە ویست و ئیرادەی خۆیان زیرەک و ئەوانیش بە ویست و ئیرادەی خۆیان تەمبەڵ و تەوەززەل دەرچوون!

دەتوانین بڵێین لێکچوونێک لەنێوان نابینا و کەودەندا هەیە. هەردووکیان نابینان؛ بەڵام ئەمیان چاوی نابینێت و ئەویان بیری. خەڵکیش ڕاهاتوون یارمەتی نابینا بدەن و هاوسۆزیی لەگەڵدا بکەن لە کاتێکدا لۆمەی کەودەن دەکەن کە پێیان وایە خۆی وای لە خۆی

کردووه... نازانن ئەمیش هەر وەک نابیناکە هیچ دەسەڵات و ویستێکی خۆی تێدا نییە کە توشی بووە!

کێشـــەیەکی دیکەش لەم بارەیەوە هەیە، کەســـی بیرکۆڵ خۆی بەخۆی نازانێت کە وایە و دانیشی پێدا نانێت.

لە پەندێکی باوی ناو خۆماندا هاتووە دەڵێت: (ئەو کاتەی خودا ڕۆزیی بەسەر خەڵکیدا دابەش کرد، کەس بە بەشی خۆی ڕازی نەبوو، کەچی کاتێک عەقڵی دابەش کرد، هەمووان بە عەقڵی خۆیان ڕازی بوون).

ئەم پەندە لێرەدا یارمەتیمان دەدات. کەودەن خۆی دانی پێدا نانێت کە کەودەنە. خۆشـــی پێ لە دیگەران ژیرترە. زیاتر لەوەشـــی لۆمەی خۆی بکات لۆمەی ئەوانی دیکە دەکات. بێگومان لە داهاتوودا ئەم کێشـەیەش لەلایەن شارستانییەتەوە بە شێوەیەک لە شێوەکان چارە دەکرێت. کۆمەڵگە لە داهاتوودا بەو شـــێوەیەی مامەڵە لەگەڵ نابینادا دەکات، مامەڵە لەگەڵ کەودەنیشـــدا دەکات؛ واتە یارمەتیی دەدات و بەزەیی پێدا دێتەوە... کەودەنیش لە حاڵی خۆی تێدەگات و خۆی بە پیشـــەیەکەوە دەنێت لەگەڵیدا بگونجێت. کۆمەڵگە هۆی ژیان بۆ کەودەنیش دابین دەکات وەک ئەوەی بۆ زیرەکی دابین کردووە... هەردوولا بەرهەمی کۆمەڵگەن و هیچکامیان دەســـەڵاتی خۆیانی تێدا نییە. حەیفە جیاوازی لەنێوان خەڵکیدا لەســـەر شـــتێک بکەین کە دەسەڵاتی خۆیانی تێدا نییە.

## فەرهەنگۆک

**گوتەزا:** مقولة: category

**دەرئاساناسی:** علم الخارقية: pharasicology

**سووسەکردن:** پەی بردن بە شتێک :حدس

**پێشگۆیی:** التنبؤ

**چاوتیژی:** البصيرة

**پەری:** جنۆکە

**نیگا:** **وەحی:** Inspiration: خستنەدڵ

**کەوی کردن:** ڕام کردن: تسخير

**لوواو:** **ممکن:** possible

**سەکۆ:** ستەیج، مەسرەح. سەکۆی شانۆ

# پێڕست